د. فەرهاد پیرباڵ

# ژەنەراڵ شەریف پاشا

( ١٨٦٥ - ١٩٥١ )

یەکەمین سیاسەتمەداری کورد
کە داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ کورد کرد



# ژەنەراڵ شەریف پاشا

## (١٨٦٥-١٩٥١)

**یەکەمین سیاسەتمەداری کورد**

**کە داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ کورد کرد**

**نوسینی: د. فەرهاد پیربال**

**سەرنج :**

**هەرکەم وکوڕیو ناتەواویەك لە وێنەو بەڵگەنامـەکاندا هـەبێت ، نووسـەر لێـی بـەر پرسـیارە، چونکە نووسەر جگە لەو وێنەو بەڵگەنامانە هیچی تری نەبووە بۆ بڵاوکردنەوەو بوونیشیان لـە کتێبەکەدا گرنگ بوو.**


- ناوی کتێب: ژەنەڕاڵ شەریف پاشا
- ناوی نووسەر : د. فەرهاد پیربال
- بابەت: تۆژینەوە
- ئەرشیفی: ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی لە هەولێر
- مۆنتاژ: سەیران عبدالرحمن
- تیراژ: ٦٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن : ٣٣٦ ی ٢٠٠١
- چاپی یەکەم : سلێمانی
- کۆمپیوتەرو ئۆفسێتی دەزگای سەردەم

**زنجیرە کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم ( ١٦٨ )**

## پێشکەشە :

ئەم کتێبەم، پێشکەشە بە باوکم، **پیربـاڵ قـەصاب**، کە ئێستاش، لە تەمەنی ٩٢ ساڵیی خۆیدا، کاتێ لە بەختی کورد توورە دەبێ، بە هەمان ئاوازی دڵشکاوی ژەنەراڵ شەریف پاشاوە، دەڵێ:

"ئەجاغدەن مەشە ئۆڵماز
کوردتەن پەشە ئۆڵماز"
"جەمشیدی شا ئۆڵرسەو
کیمسە بەخماس یووزووە
مەعریفەت مەنقرە دەگماس
ئەهلی پوول دەورانیدیر".
واتە :
دار ماشەی لێ دروست نابێ
کورد پاشای لێ پەیدا نابێ
با جەمشیدی پاشاش بیت
کەس تەماشای چەهرەت ناکا
ئەمڕۆ سەردەمی پارەدارانە

# له جیاتی پێشەکی

ئـەم کتێبـە هەوڵدانێکـە بـۆ نیگـاراندنی پۆرترێتـی سیاسـەتمەدارێکی کـوردی "دوورە وڵات"، کە بۆ یەکەمین جار لـە مێـژووی خـەباتی نێودەوڵـەتیدا، خـەونی بـە دامـەزراندنی دەوڵەتێکی کوردییەوە دەبینی و کاریشی بۆ دەکرد؛ هەروەها هەوڵدانێکە بـۆ کۆکردنـەوەی پارچە زیواڵ زیواڵەکانی مێژووی نەتەوەیـەك کـە لـە چـارەکی یەکـەمی سـەدەی بیسـتەمدا چاوی ئاواتی بڕیبووە ئەم سەرکردە تێکۆشەرە.

ژەنـەراڵ شـەریف پاشـا (١٨٦٥-١٩٥١) ڕیشـەی لـە سـلێمانی، دڵـی لـە دیاربـەکر، دەستێکی لە ئەستەمبوڵ، دەستەکەی دیکەی لە ستۆکهۆڵم؛ قاچێکی لە پاریس، قاچەکـەی دیکـەی لـە پایتـەختی بـەریتانیا.. هەشـتا سـاڵ ژیـا و خـەباتی لـە پێنـاو دامـەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیدا کـرد؛ کـەچی هیچـی بـە هیـچ نـەکرد. گۆڕەکـەی، ئێسـتا، ئـەوەتا لـە قاهیرە: نازانین لە کام گەڕەك و لە کام گۆڕستان کەوتووە.

دەبێ دانی پێدابنێـم: ئـەوەی وای لێکـردم ئـەم سـەرکردە کـوردە "نەناسـراو"ەم خـۆش بوێت، ئەوەی هانی دام بچم بـۆ مـاوەی حـەوت سـاڵان لـە پـاریس بـە دووای ئـەم ژەنەراڵـە کوردەدا وێڵ بم و بەدووای ساغکردنەوەی پارچە ونبووەکانی ژیانیدا بگەڕێم؛ پێـش هـەموو شتێك: سەرسامیی خۆم بوو بۆ شەخسیەت و ژیانی جەنجاڵی پڕ جەربەزەیی ئەم پیاوە. مـن، بە تەواوەتی، ژیان و شەخسیەتی خۆمم لە ئەودا دەدیتەوە. بە تایبەتیش، کاتـێ لـە ڕێگـەی پشکنینی دۆسییە شەخسییەکانی خۆیەوە لە پۆلیسخانەیەکی گـەڕەکی پێنجـەمی پـاریس، بۆم بە دیار کەوت کە ئەم زاتە گەورەیە، لە کۆتایی ژیانیدا -دووای ئەم هەموو سەڵتەنەتو سامان و تێکۆشانە، کە دەیویست ببێتە سـەرۆك دەوڵـەتی کوردسـتانی گـەورە!- نـائومێد دەبێت: هەموو پارەو سامان و ژیـانی خـۆی لـە قومـارو کـەیف و نـایت کڵەبـەکان سـەرف

دەکات. لە کۆتاییشدا کە ئیفلاس دەکات، بێ پارەو پوول، بێ ماڵ و حاڵ، لەسەر جادەکانی پاریس دەکەوێت: وەك هەر لانەواز و لاکەوتەیەکی سەر شەقام ژیان بەسەردەبات. ئەم شکستە سیاسییە، ئەم نائومێدییە، ئەم ئاخرشەڕییە.. بەهرەی نووسینی ڕۆمانێکی دامێ. بەڵام پێش کەوتنە سەر نووسین، هەستام هەرچی بەڵگەنامەیەکی پەیوەندیداری ئەم ژەنەراڵە کە من دەستم دەیگەشتنێ، لە کتێبخانەکانی پاریس کۆم کردنەوە و تەرجەمەم کردن، وردە وردە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاوم کردنەوە، ئیدی، وردە وردە، ناوی ژەنەراڵ شەریف پاشا کەوتە سەر زمانی شاعیرانیشەوە.

ئەم کتێبەی بەردەست، کەواتە، کتێبێکی ئەکادیمی نیە: هەرچەند، لە ئاکامدا، ئەم بەڵگەنامانە، زیاتر هەر خزمەتی توژەرو مێژوونووسان دەکەن، بەڵام کولتوور، لە ئاکامدا، هەموو ئەم تام و بۆ و بینینە یەکانگیرانەیە بەسەر یەکترەوە. من بۆ خۆیشم ، هەرگیز، نەمتوانیوە -ناشزانم بتوانم- کە مێژوو لە هونەر جودا بکەمەوە.

ژەنەراڵ شەریف پاشا (١٨٦٥-١٩٥١) جگە لەو یاداشتنامەیەی بە زمانی فەڕەنسی لە بارەی (داخوازییەکانی گەلی کورد) لە ساڵی (١٩١٩)دا لە پاریس بلاوی کردۆتەوە، هەروەها بلاوکردنەوەی گۆڤارێك بە ناوی مەشرووتیەت بە زمانی فەڕەنسی؛ بە پێی لیستی ئەو کتێبە کۆنانەی لە ئەرشیفخانەی ئینالکۆ لە پاریس پارێزراون: خاوەن چەندین کتێبی دیکەشە بە زمانی عوسمانلی و فەڕەنسی، لەوانە: کوردامان- اهل صلیب- بە فەڕەنسی، هەروەها (قرواسان).

کوردستان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، واتە لە سەردەمی شەریف پاشادا- کە سەردەمی دابەشکردنێکی تازەی کوردستان و پلانە گلاوەکانی داگیرکەران بوو- بە ژیانێکی هەژەند و پڕ لە کارەساتی ئەوتۆدا ڕەت دەبوو کە هەر هەفتەیەکی ژیان: ڕاپەڕینێك بوو، هەر مانگێك: لاپەڕەیەکی درەوشاوەی مێژوویی بوو، گۆڕانکارییەك بوو، هەنگاوێکی شێرانەی تازە بوو.

(گەنجە کوردەکان)[1] ئەو نووسەر و رووناکبیرە کوردانە بــوون کـە لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەم و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا، بەشـی هــەرە زۆریــان، بــە خواســتی خۆیــان، پەرتەوازەی شاری ئەستەمبول ببوون، لەوێ -لە لایەکــەوە لـەژێر کاریگـەریتیی کولتــووری ناسیۆنالیستی تــورك و ئەرمــەن و عــەرەبدا، لـە لایـەکی دیکەشـەوە لـەژێر کاریگـەریتیی راستەوخۆی کولتــووری ئــەورووپی، بـە تایبــەتی فەرەنسـیدا- دەیانویسـت دوورە وڵاتبوونـی خۆیان بکەنە تریبوونیك بۆ بووژاندنەوەی جموجولی ناسیونالیســتی کــوردو تازەکردنــەوەی کولتــــووری کــــوردی. یــــەکیك لــــە دیــــارترین ئــــەو رووناکبــــیرە دوورە وڵاتانــــە، ژەنەراڵ شەریف پاشا بوو.

ئەم دوورە وڵاتییە خواستمەندانەیەی (گەنجە کوردەکان) لــە ئەسـتەمبولدا بـە یەکـەمین هەنگاو لە قەڵەم دەدریــت لـە میــژووی دوورەوڵاتیـی کـورددا، کـە وەك دەسـتاوەردیك، بـە شیوەیەکی نەخشە بۆکیشراو، بـەکاری بـهینن بـۆ دروسـتکردنی دیـالۆگیکی شارسـتانیانە لەگەڵ جیهان و کولتووری رۆژئاوادا: لە پیناو تازەکردنەوەو بوژاندنەوەی ژیانی کولتووریو سیاسی کورد[2].

ئەم رووناکبیرە گەنجــە کوردانــە، لەهــەر چوارپارچەکــەی کوردســتانەوە روویــان کردبــووە ئەستەمبول. گەلیك لەو رووناکبیرانە، لە زانکۆکانی ئەنقەرەو ئەســتەمبول و پایتەختــەکانی ئەورووپا خویندبوویان و بروانامەی بەرزیان هینابۆوە یان بەلای کەمییەوە فیری زمانــەکانی تورکـی و فەرەنسـی و ئــەلمانی و رووســـی و یۆنــانی و ئینگلــیزی ببــوون. ئــەو زمانــە بیگانانــەیان بــەکاردەهینا بــۆ دەولەمــەنکردنی ئــەدەبیاتی کــوردی و بەرەوپیشــەوەبردنی دۆزی کورد.

بە کورتی: لەسەر دەســتی ئـەو نووســەر و رووناکبـیرە گەنجـە کوردانـەدا بـوو کـە بـیر و نووسین، بیری نەتەوایەتی و رۆژنامەنووسی، تیکەل بە یەکتر بوون؛ چەمکی تـازە لـە بـارەی سیاسەت و ژیان و ئەدەب و شارستانیەت هاتنە ئاراوە.

(گـە نجـە کوردەکـان) یەکـەمین نـەوەی ڕووناکبـیرانی کـوردن کـە دووره وڵاتییـان، بـۆ یەکەمین جار، وەك "پرۆژەیەکی مەعریفی" بەکارهێنابێت و بە ڕاسـتیش لـە سـتراتیژیەتی ئـەو دووره وڵاتییـە تـێ گەیشـتبن. یەکـەمین هـەنگاوی ئـەم سـتراتیژیەتەیان بڵاوکردنـەوەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بوو لە ساڵی ۱۸۹۸دا لە شاری قاهـیره. پاشـانیش -لـە مـاوەی ساڵانی ۱۹۰۰-۱۹۲۳دا دامەزراندنی یەکەمین چاپخانە و قوتابخانە کوردییەکان و چەندین کۆمەڵـە و ڕێکخـراوی پیشـەیی و ڕووناکبـیری و سیاسـی، هـەروەها بڵاوکردنـەوەی دەیـان کتێبی دانسقەی تازەو ڕۆژنامە و گۆڤاری جۆراوجۆر لە دەرەوەو ناوەوەی کوردستاندا[٣].

جگە لە ئەستەمبوڵ و قاهیره، کە لـەو سـەردەمەدا دوو مەڵبـەندی بڵاوکردنـەوەی بـیری نەوژەن بوون -نەك تەنیا بۆ کورد بـەڵکو بـۆ گـەلانی فـارس و عـەرەب و ئەرمـەن و تـورك خۆیشی- لە هەمان کـاتدا ئـەورووپاش (بـە تایبـەتی پـاریس و ژنێـڤ و لـەندەن) بـە سـێ مەڵبەندی گرنگ دەژمێردرێن کە نووسەرو سیاسەتمەدارو ڕووناکبیرانی کـوردی دووره وڵات چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆیان تێدا ئەنجام دابێ[٤].

لە مـاوەی ساڵانی ۱۸۹۷-۱۸۹۹دا، ڕووناکبیری کورد، د. عـەبدوڵڵا جـەودەت، لەگـەڵ هاوڕێکەی ، د. ئیسحاق سکووتی، کە پێکەوە لە زیندان و لە دەست زەبروزەنگـی سـوڵتان عەبدولحەمیددا ڕایانکردبوو، خۆیان گـەیاندبووە ژنێـڤ: لـەوێ دوو ڕۆژنامـەیان بـە زمـانی عوسمـانلی (تورکـی) دەردەکـرد؛ یەکـەمیان عوسمـانلی (۱۸۹۷-۱۹۰٤). دووەمیشـیان اجتهاد (۱۹۰٤). لەگەڵ ڕۆژنامەیـەکی دیکـە بـەزمانی فەرەنسـی بەناونیشـانی osmanli (۱۸۹۷ـ ۱۸۹۹) کە پاشکۆی ڕۆژنامەی (عوسمانلی) بوو[٥].

لە لایەکی دیکەشەوە، ژەنەراڵ شەریف پاشا، لە ماوەی ساڵانی ۱۹۰۹-۱۹۱۳دا، واتـە دوای هاتنـە سـەر حوکمـی تورکـە لاوەکـان Juns rurcs گۆڤـارێکی بـە ناونیشـانی (مـەشروتیەت Mechroutiette) بە زمانی فەرەنسی لە شاری پاریسـدا بڵاودەکـردەوە، ئـەو

گۆڤـارە ئۆرگـانی حزبەکـەی خـۆی بـوو، حزبـە رادیکـــالی عوسمـــانی- Parti Radicali (Ottoman)[٦].

خوێنەر کە لاپەڕە درەوشاوەکانی ئەو ڕۆژنامـە و گۆڤارانــە دەخوێنێتــەوە، زۆر بــە باشــی لەوە تێدەگـات کـە لـەو ماوەیـەدا، لـە ئـەورووپا، (عــەبدولڕەحمان بـەدرخان) و (عــەبدوڵلا جەودەت) و (شەریف پاشا) و (ئیسحاق سکووتی) لە پاریس، لە ژنێڤ، لە لەندەن.. تــا چ ڕادەیـەك لـە غـەمی چـارەنووس و داهـاتووی نەتـەوە ژێردەسـتەکەی خۆیـان بوونـــە؛ چــۆن توانیویانە دوورە وڵاتیی خۆیان بکەنـە سـتراتیژیەتێك بـۆ خـەباتی سیاسـیو ڕووناکبیرانـەی خۆیان. ئەمـەش، بێگومـان، نەك تەنیا لە ڕێگای نووسـین بـە زمـانی فەرەنسـی، عوسمـانی، کوردی لەو گۆڤارانەدا بەڵکو بە خەباتی سیاسیو ڕێکخراوەیـی و بەشـداربوون لـە چـەندین کۆنفرانسی نێودەوڵەتیانەی جۆراوجۆر لە ماوەی ساڵانی ١٩٠٠-١٩٢٣دا[٧].

ئەو ڕووناکبیرە گەنجە کوردانە، کە ژەنەراڵ شەریف پاشا یەکێك بوو لە ئەوان، بزووتنــەوە نەتەوەخوازییەکەی ئەو سـەردەمەی کوردسـتانیان، لـە ئاسـتی سـەرزارەکییەوە، لـە ئاسـتی کارەسـات و ڕاپەڕینـە ڕۆژانەکانـەوە گـەیاندە ئاسـتی نووسـین و هۆشـیاری و ئایدیۆلۆژیـا: ئاستێك کە ئیــتر "مێژوونووســەکان" ئــەم بزووتنــەوە ڕۆژنامـەنووسـییە بکەنـە بەڵگەیـەك و سەنەدێك.

خاسیەتێکی دیکەی ئەم بزووتنەوە نەتەوەخوازییەی گەنجە کوردەکـان: جیـاوازیی دیـدی سیاسیو فرەیی بیرەکان بوو. دەبینین، لە هـەمان کـاتدا، بـۆ نموونـە بـیری پـان ئیسـلامیو ریفۆرمیزم، ڕووبەرێکی فراوانیان لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامـە و گۆڤارەکاندا داگیرکردووە.

زۆربەی نووســەرو ڕووناکبـیرە گەنجـە کوردەکـان، لـەو سـەردەمەدا، سـەر بـە ڕێکخـراوی "ئیتیحادو تەرەقی" بوون: هــەر لـە د. عـەبدوڵا جـەودەت و د. ئیسـحاق سـکووتییەوە کـە دامــەزرێنی ڕێکخراوەکـە بـوون تـا دەگاتـە ژەنـەراڵ شـەریف پاشـاو میقـداد- مەدحـەت و عبدالرحمان بەدرخان.

بە شیوەیەکی گشتی، لە بواری بزووتنەوەی سیاسیی ئەو رووناکبیرە گەنجە کوردانەدا، پینج رەوتی سیاسیی جیاواز لەو سەردەمەدا بەدی دەکرین:

١- رەوتی عەلمانی و فیدرالی، کە لەژیر کاریگەریتیی ئەزموونی رۆژئاواو بیری ئەورووپیدا، باوەری وابوو کە نەتەوەی کورد، وەك ئەرمەن و عەرەب و تورك و چەرکەس، پیکەوە، لە چوارچیوەیەکی فیدرالی عوسمانیدا، بە ئاسانی، دەتوانیٚ بە ئامانجەکانی خۆی بگات. ئەمەش، پرۆگرامی گشتیی "ئیتیحادو تەرەقی" بوو. د. عەبدولاّ جەودەت دامەزرین و سەرگەڤازی ئەم رەوتە بوو، تەنیا لە کۆتایی ژیانیدا لیی پەشیمان بۆوە. ئەم رەوتە بە هیچ شیوەیەك لە ژیان و بەرژەوەندییەکانی کوردەوە نزیك نەبوو، خزمەتی کوردیشی نەکرد.

٢-رەوتی پان ئیسلامی، کە باوەری وابوو دین (شەریعەت ویاساکانی ئیسلام) دەتوانیٚ هەموو ئازادی و مافە نەتەوەییەکانی کورد، لە چوارچیوەی هەمان ئیمپراتۆریەتی کۆنی عوسمانیدا دابین بکات. سەعید نەورەسی و عبدوالرحیم رەحمی هەکاری نموونەی دیاری ئەم رەوتە بوون. دیسان ئەمانیش نەیاندەتوانی لە ژیان و رۆحییات و بەرژەوەندییەکانی کورد تیبگەن.

٣- رەوتی ریفۆرمیستەکان، کە لەوانەیە ژمارەیان، لە چاو رەوتەکانی دیکە، زۆر کەمتر بووبیت. باوەریان وابوو کە دەکریٚ بە ئامۆژگاری و پارانەوەو ریفۆرم، هەندیٚ لە ئازادیو مافە نەتەوەییەکانی کورد لە سولتان عەبدوالحمید وەربگیریت نموونە و سەرگەڤازی ئەم رەوتە، میقداد- مەدحەت بەدرخان بوو کە لە یەکەمین پینج ژمارەی رۆژنامەی کوردستان (قاهیرە: ١٨٩٨) ئەم رەوتەی گرتبووەبەر؛ کە بیگومان سەرنەکەوت، تەنانەت بە زیانیش شکایەوە.

٤-رەوتی شۆرشگیرە چەکدارەکان، کە باوەریان وابوو بە راپەرینی چەکداری و هیزی پەلاماردەر هەموو ئازادی و مافە نەتەوەییەکان وەدەست دەهینرین. شیخ عوبەیدولای

نەهریو کوڕەکانی، نموونەی ئەم ڕەوتەن. دیارترین کەماسیو هەڵەی ئەم ڕەوتـە ئـەوەبوو کـە نـەیاندەتوانی لـە چوارچێـوەی جوگرافیـی خۆیـان بچنـە دەرەوە: سروشـتێکی دینـیو عەشـایەرگەرییان هـەبوو نـەك کوردسـتانی. جگـە لەمانـەش، پەیوەندییـەکی تونـدو نەخشەسازییان لەگەڵ ڕووناکبیرە ناسیووناليستەکان نەبوو.

٥-ڕەوتـی ڕووناکبـیرە ناسیووناليسـتە جوداخوازەکـان، کـە باوەڕیـان وابـوو پێویسـتە نەتەوەی کورد سەربەخۆبێت ، لەژێرئاڵای نەتەوەیی خۆیدا بژیت ٠حاجی قـادری کۆیـی وەك شاعیرێك، دەمێك بـوو بـە شـیعر ئـەم ئاڵایـەی بـەرزکردبۆوە،٠ لـەناو ڕووناکبیرەکانیشـدا، هەندێ لەوانەی کە لە سەرەوەدا ئاماژەمان بۆ کردن، وەك سورەییاو عبدوالرحمان بەدرخان، پاشانیش ژەنەراڵ شەریف پاشا لە ١٩١٩دا نموونەی ئەم ڕەوتە بوون.

بە شێوەیەکی گشتی، ئاڵاهەڵگرانی ئەم ڕەوتە ناسیونالیسـتە ئـازادیخوازە، زۆر درەنـگ بەدیارکەوتن، ڕاستتریش وایە بڵێین: زۆر درەنگ لە یەکتر کۆبوونـەوە. ئەمـەش چونکـە هـەر هەموویان، پێشتر، بە شێوەیەکی جیاواز بیریان دەکردەوە: لەناو ڕێکخراوەکانی "ئیتیحـادو تەرەقی"، "پارتی ڕادیکاڵی عوسمانی"، یان لەناو حزب و کۆمەڵە پرژوبڵاوە بچووکـەکانی دیکـەدا کاریـان دەکـرد. هـەرگیز نـەیانتوانی و نـەیانزانی کـە حزبێکـی کوردسـتانیی سەربەخۆی یەکدەست و یەکڕا دروست بکەن. هەرسێ چوارێك، یان شەش حەوتێك پێکـەوە، بە جیا، لەناو ڕێکخراوێك، جەمعیەتێك، حزبێکدا بوون.

سـاڵی ١٩٠٨ ئاوێنەیـەك بـوو کـە ڕووی ڕەشـی دکتاتۆرییانـەی حزبـی "ئیتیحـادو تەرەقی"ی زۆر بە ڕوونی پیشانی "گەنجە کوردەکان"دا. ئیتر لەم سـاڵە بـەملاوە ڕووناکبـیرە گەنجە کوردەکان تێگەیشتن کە ئەو حزبەی بـە درێژایـی ژیانییـان کاریـان بـۆ دەکـرد، هیـچ ماف و ئازادییەك نابەخشێتە کورد. بەم شێوەیە، وردە وردە، ئەو ڕووناکبیرە گەنجـە کوردانـە لە "ئیتیحادو تەرەقی" و ڕەوتەکانی دیکە پاشگەز بوونەوە: ڕوویـان کـردە ناسـیووناليزم و پێکهێنانی "تەشکیلاتی" تازە.

ژەنەراڵ شـــەریف پاشـا یـەکێك بـوو لـەو پاشـگەزانە. بـە ڕاسـتیش، خوێندنـەوەی بـیری سیاسیی ئەم سیاسەتمەدارە، تۆژینەوە لە پەرەسەندنی بیری نەتەوەیی ئەم کەڵەپیاوە، کارێکی زۆر سەنجڕاکێش و لە هەمان کاتدا بەسوود دەبێت بۆ مێژووی کورد.

پەرەسەندنی بیری سیاسـیی بەرهەڵسـتکارانەی ژەنـەراڵ شـەریف پاشـا (١٨٦٥-١٩٥١ سێ قۆناغی ئاشکرای تێدا دەبینرێت:

-قۆناغی ئیتیحادو تەرەقی (١٩٠٠-١٩٠٨).

-قۆناغی ڕادیکاڵیزم (١٩٠٩-١٩١٤).

قۆناغی ناسیوونالیزمی کوردی (لە ١٩١٨ بەملاوە).

دووقۆنـاغی یەکـەم، هـەردووکیان، دەکـرێ بـە پـان عوسمـانیزم بژمـێردرێن. قۆنـــاغی سێیەمیش بە چڵەپۆپەی ناسیوونالیزم دادەنرێت، چونکە ئەو، یەکەم سیاسـەتمەداری کـوردە کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی کردبێت لە ئاستێکی نێو دەوڵەتیدا.

بـەم شـێوەیە، دەبینـین: وازهێنـان لـە ئایدیۆلۆژییـەتی پـان عوسمـــانیزم، فیدراڵـــیزم، ڕادیکـاڵیزم.. وەك لای شـەریف پاشـا دەبینـین، وای کـــرد کـــە ئـــەو توخمانـــەی جموجوڵـــی ناسیوونالیزمی کورد پێکدەهێنن، هێدی هێدی، لە یەکتری کۆببنەوە.

**د. فەرهاد**

**هەولێر: بەهاری ١٩٩٩**

## سەرچاوەو پەراویزەکانی پیشەکی:

١-د. عەبدولا جەودەت، لەسەر وەزنی (تورکــە گەنجــەکان) بــۆ یەکــەمین جــار نــاو لــەم نەسلە کوردە دەنێ "کوردە گەنجەکان". بروانە: عبدالله جودت: بیر خطاب، گۆڤــاری (رۆژی کورد)، ئەستەمبول، ژمــارە (١)، ئەســتەمبۆل: ١٩١٣، ل ٤. پاشــانیش، حــاجی مووســای سەرۆك عەشیرەتی کۆرچیخان، یارمەتیدەری ریکخراوی هیڤی، ئــەم زاراوەیــەی بــەکارهیناو گوتی: "ئەگەر گەنجە کوردەکان کوورەیــەك دروســت بکــەن، ئیمــە ئامــادەین ببــین بــە دارو خۆمــان لەو کوورەیەدا بسووتینین). بروانە: عبدالله بابەکر حەمەد ئاغا: رۆژنامــەوریکخراوە کوردییــەکانی تورکیــا ،لەتورکییــەوەئامادەی کــردووە، کــاروان، ژمــارە ٦٤، س ١٩٨٨، ل ٨٨-٩٢. هــەروەها کوردناســی رووس، ڤ. ئــە. گەردلیڤســکی، بــە هــەمان شــیوە، زاراوەی (گەنجــە کوردەکــان)ی بەرامبــەر (گەنجــە تورکــەکان) بــەکارهیناوە. بروانــە: لاهووتــی: کوردستان و کورد، و جەبار قادر، گ. هەزارمیرد، ژ (٣)، سلیمانی: ١٩٩٨، ل ١٦٢.

٢=جلیلی جلیل، نهضة الاكراد الثقافة و القومية في نهاية القرن التاسع عشر و بداية القرن العشرين، ترجمه باظآ نازی، د. ولاتو، كدر، الطبعة الاولى: ١٩٨٤.

٣-Malmisanij u M. Lawendi: rojnamegeriya Kurd 1908-1981, JN stockholm 1980.

٤- روناکبیری کورد، قەدرجەمیل پاشا (زنار سلوپی) دەلی کە سای ١٩١٣دا لقیکی ریکخراوی هیڤییان لە شاری ژنیــڤ کردۆتــەوە. بروانــە کتیبەکــەی زنــار صلوبــی فی ســبیل کردستان. ت: ر. علی، رابطة كاوا، دار الكاتب بيروت. ١٩٨٧ ص: ٢٨.

G. Grac- I. Caglar: la Presse Fransaise de Tur quie de 1795 a nos Jours-٥
(historire et catalogue) Ed.. Paris: 1985. Pp. 192-193, 196- 197.

٦-د. فەرهاد پیربال: ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، بڵاوکراوەکانی سەنتەری برایەتی، هەولێر: ١٩٩٨، کۆدی ئەم گۆڤارەی شەریف پاشا لە کتێبخانەی لانگزۆ لە پاریس، ئەمەیە: (ڕۆژنامەکە: Per 18). (گۆڤارەکە: Per. 5423).

٧-بڕوانە وتاری (کرۆنۆلۆژیای دووره ولاتی)، گۆڤاری یەکگرتن،ژمارە:١١ کۆپنهاگن:٠ ١٩٩٠

# ژەنەڕالْ شەریف پاشا

## ( ١٨٦٥-١٩٥١ )

## کورتەی ژیان و چالاکییەکانی



کاریکاتێری شەریف پاشا بە پەڕەمووچێکی سویدی لە ١٨٩٩

**:١٨٦٥**

**محەمەد- شەریف پاشا، برای گەورەی سێ برایان (عیزەت بەگ، سلێمان بەگ، فوئاد پاشا) کە هەرسێکیان ئەفسەری بەرزبوون لە لەشکری دەوڵەتی عوسمانیدا، لە ئەستەمبوڵ چاوی بۆ دنیا هەڵێناوە[(١)].**

**باوکی شەریف پاشا، کە لە بنەماڵەی (خەندان) بووە، ناوی سەعید پاشای کوڕی حوسێن پاشای ئەحمەد ئاغای خەندان بووە. لە ئەستەمبوڵ لە (غلطة سرای) لە مەکتەبی سوڵتانی خوێندوویەتی، پاشان لە نەظارەتی دەرەوە لە تەرجومەی زماندا دانراوە، پاشان هاتووە بۆ نەظارەتی ناوخۆ. زۆر وەزیفەی گەورەی لە قەفقاس و قارس بولگاریادیوە.بۆتە پارێزگاری (ڤارنا)، پاشان کراوە بە والیی جەزائیری بەحری سفید، ئینجا لە ساڵی (١٨٨٦)دا، سەعید پاشا، بۆ ماوەی سێ ساڵ، کراوە بە باڵوێزی فەوقەلعادە لە بەرلین. دووای ئەوە کراوەتە باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی لە پاریس. لە کۆتاییشدا بۆتە وەزیری دەرەوەو جێگری وەزیری تەندروستی لە دەوڵەتی عوسمانیدا. لە دووا قۆناغەکانی ژیانیشدا کراوەتە سەرۆك شوورای دەوڵەت، تامردنی لەم پایەدا ماوەتەوە[(٢)].**

**سەعید پاشای باوکی شەریف پاشا، مەکتەبی ڕوشدیەی عەسکەریی لە شاری سلێمانی کردۆتەوە، ئەمەش لە ساڵی (١٨٩٣)دا کە دەرچووانی پۆلی یەکەمینی بۆ ئامادەیی عەسکەری لە ساڵی (١٨٩٥)دا بۆ بەغدا نێردراوە. دووای سێ ساڵی تریش، لە (١٨٩٩)دا ئەم پۆلە چۆتە قوتابخانەی جەنگی ئەستەمبوڵ. محەمەد ئەمین زەکی بەگ یەکێك بووە لەو قوتابیانە[(٣)].**

**سەعید پاشا(١٨٢٦ -١٩٠٩) کچی یەکێك لە وەزیرەکانی دەوڵەتی عوسمانیی هێناوە، سەعادەت خانم. لەم ژنەدا، لە ساڵی (١٨٦٥)دا شەریف پاشا لە دایك بووە.**

دووای جودابوونەوەیان لەگەڵ سەعادەت خانمی دایکی شەریف پاشا، ژنیکی دیکەی چەرکەسی هیناوە بە ناوی گولعوزار خانم کە دەبیتە دایکی فوئاد پاشا[٤].

**١٨٧١-١٨٧٥:**

شەریف پاشا چەند سالیك لە سلیمانی، لە قوتابخانەی خواجەکاندا لەگەڵ شیخ مەحموود پیکەوە فیری خویندن و نووسین بووە: عوسمانلیو عەرەبیو فارسی.

**١٨٧٦-١٨٨٤:**

لە ئەستەمبول دەخوینێ، پاشان خۆی فیری زمانی ئیتالی و فەرەنسی و یۆنانی دەکات.

**١٨٨٤:**

یەکەمین پلە وپایە ئیدارییەکانی دەولەتی عوسمانی وەردەگریت بە روتبەی (فەریق).

**١٨٨٥-١٨٨٩:**

لە پاریس، لە قوتابخانەی عەسکەریی سانت- سیر دەخوینیت[٥] هەر لەو سالەشدا پایەی ژەنەرالی پی دەبەخشن.

**سەرەتای ١٨٩٠:**

دەگەریتەوە بۆ ئەستەمبۆل و دەکریتە یاوەری پاشا.

**ناوەراستی ١٨٩٠:**

ژنهینان: ئەمینە خانمی کچی عەباس حیلمی کوری تۆسۆنی کوری محەمەد عەلی پاشای والیی میسر دەخوازیت باوکی ئەمینە خانم لە سالانی (١٨٤٨-١٨٥٤)دا خدیویی میسر بووە.

ئەمینە خانمی ژنی شەریف پاشا، کـە دەکاتـە کچـی مـامی مـەلیك فـارووقی میسـر، ئـافرەتێکی سـەنگین و تێگەیشـتوو بـووە، زمانـەکانی فەڕەنسـی و سـوێدی و ئینگلـیزیی زانیوە، لە ساڵی (١٨٦٨) لە قاهیرە لە دایکبووەو لە ساڵی (١٩٢٦) لە پاریس مردووە.

شـەریف پاشـا سـێ کچـی لـە ئەمینـە خـانم هـەبووە: زەینـەب، شـەریفە، سـزا. کچـی یەکەمیان هەر بە منداڵی لە ئەستەمبوڵ مردووە.

**:١٨٩٧-١٨٩١**

شەریف پاشـا پلـە وپایـەی لـە دەوڵـەتی عوسمـانیدا وردە وردە و سـاڵ بـە سـاڵ بـەرزتر دەبێتەوە بە تایبەتی لە بواری ئیداری و سەربازیدا لە ئەستەمبوڵ[٦].

**:١٨٩٨/٣/٤**

دەنێردرێتە سـتۆکهۆڵم، لـەوێ دەبێتـە ئامباسـادۆری باڵوێزخانـەی دەوڵـەتی عوسمـانی (نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی) لە سوید، تـا سـاڵی (١٩٠٨)[٧]. هـەر لـەوێ فـێری زمـانی سوێدی و ئینگلیزی دەبێت.

**:١٨٩٩**

لـە سـتۆکهۆڵم هاوڕێیـەتی لەگـەڵ پاشـای سـوێد، ئۆسـکاری دووەم (١٨٢٩-١٩٠٧) پەیدا دەکات.

لە پایزی ئەم ساڵەدا، لە کاتی مانۆڕێکی سەربازیدا لە مەڵبـەندی سـکۆنە لـە سـوێد، لەگـەڵ ئۆسـکار پاشـای وڵاتـی سـوێد بـە جووتـە سـەفەرێك دەکـەن؛ دەچنە ڕاوو شکار[٨].

**:١٨٩٩/٩/١٢**

لە سوێد، خەڵاتی نیشانەی شمشێری پێ دەبەخشرێت[٩].

**:١٩٠٠**

یەکەم نیشانەکانی بەرهەڵستکاریی شەریف پاشا دژی دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵمدا دەردەکەوێ. شەریف پاشا لە کاتێکدا نوێنەرو باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانییە لە سوێد، لە ژێرەوەدا پێوەندی بە _(حزبی ئیتحادو تەرەقی)یەوە دەبەستێت و هاوکارییان دەکات، بێ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی پێ بزانێت[١٠].

**:١٩٠٢**

(سزا)ی کچی شەریف پاشا لە ستۆکهۆڵم لە دایك دەبێت.

نامەگۆڕینەوەیان لەگەڵ د. عەبدوڵڵا جەودەت لە بارەی چارەنووس و داهاتووی دەوڵەتی عوسمانی و (حزبی ئیتحادو تەوقی)یەوە، بە نهێنی[١١].

**:١٩٠٣-١٩٠٤**

ئەحمەد ڕەزا، یەکێك لە سەرکردەکانی حزبی ئیتحادو تەرەقی، کاتێ دەچێتە ستۆکهۆڵم و بۆ کاری دژایەتی کردنی دەوڵەتی عوسمانی، چاوی بە شەریف پاشا دەکەوێت؛ موختاربەگی سکرتێری شەریف پاشا ئەم خەبەرە دەگەیەنێتە سوڵتانی عوسمانی و پەردە لە ڕووی پێوەندیی شەریف پاشا بە ئیتحادییەکانەوە هەڵدەماڵێ. سوڵتانی عوسمانی داوا لە شەریف پاشا دەکات کە ئەحمەد ڕەزای ئەندامی ئیتحادییەکان بگرێت و تەسلیمی دەوڵەتی بکاتەوە. شەریف پاشا بۆ ئەم کارە ڕازی نابێت و نایکات. لە ئەنجامی ئەوە، پێوەندیی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی بە شەریف پاشا کز دەبێتەوەو گومانی بەرامبەر پەیدادەکات. بۆیە سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانی دەرکرد کە نابێت شەریف پاشا بگەڕێتەوە ئەستەمبوڵ و پێویستە هەر لە سوێد بمێنێتەوە[١٢].

**:١٩٠٧**

باوکی شەریف پاشا، سەعید پاشای خەندان، دەکرێتە سەرۆکی شوورای دەوڵەتی عوسمانی، لە کاتێکدا پلەی شەریف پاشا دەگاتە پلەی فەریقی یەکەم(١٣).

سولتان عەبدولحەمید، لەبەرئەوەی شەریف پاشا زۆر بە باشی نوێنەرایەتیی حکومەتەکەی کردووە، هەروەها لەبەرئەوەی سەعید پاشای باوکی شەریف پاشا زۆر دۆستی بووە، لەبەر خاتری خێزانەکەیشی کە خانەدانی میسر بووە؛ چاوی لە خەوشەکانی شەریف پاشا پۆشیبوو(١٤).

**:١٩٠٨/٨/٥**

شەریف پاشا خەڵاتی نیشانەی (ئەستێرەی باکوور) لە پاشای سوێد وەردەگرێت(١٥).

**مانگی ١٩٠٨/٩:**

کاتێ گەنجە تورکەکان( حزبی ئیتحادو تەرەقی) بە سەرۆکایەتیی ئەنوەر پاشاو تەڵعەت پاشاو جەمال پاشا، جڵەوی حوکمی دەستووری لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەگرنە دەست؛ هەلێك بۆ شەریف پاشا دەڕەخسێت کە بگەڕێتەوە ئەستەمبوڵ(١٦).

**:١٩٠٨/٩/٢٥**

شەریف پاشا، لە ئەستەمبوڵ، لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و داماو ئەحمەد و زولکەفەل پاشا کۆمەڵەی (کورد تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی) دادەمەزرێنن(١٧). لە هەمان ڕۆژدا یانەی کۆمەڵەکەش لە ئەستەمبوڵ دەکرێتەوەو نوێنەری شاری مووش، ڕەشید بەگ، وتاری کردنەوەی یانەکەی تێدا دەخوێنێتەوە. ئەم کۆمەڵەیە (٥٠٠) ئەندام زیاتری هەبووە. ڕۆژنامەیەکیشیان بڵاوکردۆتەوە بە ناوی (کورد تعاون و ترقی غزتەسی) کە (پیرەمێرد) سەرنوسەری بووە. هەر لەو

سەردەمەشدا پیرەمیرد لەگەڵ شەریف پاشا دەبنە هاوری و مەعرووف جیاوکیشی پیدەناسینێ[١٨].

-هەندێ سەرچاوەی دیکەش جەختی لەسەر ئەوە دەکەن کە لە ١٩٠٨/٩/١٩ شەریف پاشا لەگەڵ عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان لە ئەستەمبول کۆمەلەییەکیان بە ناوی (کوردستان تەعالی و عەزمی قەوی جەمعیەتی) دامەزراندووە. لەوانەشە هەمان کۆمەلەی پیشووبیت.

-لەم سالەدا، پیوەندیی شەریف پاشا لەگەڵ رووناکبیرە کوردەکانی ئەستەمبول (پیرەمیرد، ئەمین عالی بەدرخان، عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری، عەبدولرەحمان بەدرخان د. عەبدوللا جەودەت..) پتەوتر و خۆشتر دەبیت. هەر بۆیەش، درەنگتر دەیکەنە نوینەری خۆیان لە پاریس. پیرەمیردە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا، لە ژمارە (٨٢٠)ی رۆژنامەی (ژین. سلیمانی: ١٩٤٦)، بە فراوانی باسی پیوەندییەکانی نیوان خۆیان دەکات.

### ١٩٠٨/١٢:

حکوومەتی ئیتحادییەکان، ریکخراوە کوردییەکەی (کورد تعاون و ترقی جمعیەتی) دادەخات، دکتاتۆرییەتیکی سەختیش دەچەسپینیتە سەر ئازادی و مافەکانی گەلی کورد[١٩]. شەریف پاشا کە تا ئەم سالەش خۆی بە هەوادارو لایەنگیریکی ئیتحادییەکان دەزانی، سەبارەت بەم هەلویستە تۆرانچیتییەیان دەرهەق بە کورد لییان هەلدەگەریتەوەو دژیان دەوەستێ.

### مانگی ١٩٠٩/١:

میانەی نیوان شەریف پاشاو سەرکردایەتیی حکوومەتی ئیتحادو تەرەقی، بە تەواوەتی تیکدەچێ: لەسەر ئەوەی کە ئیتحادییەکان رازی نابن شەریف پاشا ببیتە بالویزی دەولەتی تورکیا لە پاریس[٢٠].

## مانگی٢/١٩٠٩:

شەریف پاشا دەگاتە پاریس، خۆیو خێزان و دوو کچەکەی، لەم ناونیشانە جێگیر دەبن: شەقامی ڤیکتۆر هۆگۆ، خانووی ژمارە (١٩٩). ژیانێکی شاهانە دەژین.

## ناوەڕاستی ١٩٠٩:

حزبێك بەناوی حزبی ڕادیکاڵی عوسمانی دژ بە حکومەتی ئیتحادییەکانی تورکیا، لە شاری پاریس دادەمەزرێنێ[٢١].

## ١٥/١٠/١٩٠٩:

گۆڤارێك بە ناوی مەشرووتیەت کە ئۆرگانی حزبەکەی خۆیەتی، لە پاریس بڵاودەکاتەوە تا مانگی شوباتی (١٩١٤) بەردەوام دەبێت و (٥٥) ژمارەی لیٚ بە زمانی فەڕەنسی لیٚ بڵاودەکاتەوە.

شەریف پاشا، لەم گۆڤارەیدا، کە ئۆرگانی حزبەکەی خۆیەتی، تەنانەت تا ساڵی (١٩١٤)، لە هیچ برگە و وتارێکی بڵاوکراوەی نێو گۆڤارەکەیدا باسی "سەربەخۆیی کوردستان" و "دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی" ناکات، بەڵکو دیدێکی ڕادیکاڵی و لیبرالی پێشکەش دەکات بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی دەستووریی عوسمانیی ڕادیکاڵدا[٢٢].

## ١٩١٠-١٩١٤:

پێوەندییەکی بەردەوام و پتەوی، لە پاریسەوە، هەبووە لەگەڵ (جەمعیەت) و (کلوب)و (_شەخسیات) و ڕێکخراوە نهێنییەکانی کوردستان، بە تایبەتیش لەگەڵ ئەوانی ئەستەمبوڵ و قاهیرەو ژنێف. (مەسەلەی کورد) لە ڕێگای ئەم گۆڤارەی شەریف پاشاوە دەگاتە ئاستی گفتوگۆ لەسەرکردن لە بواری دیبلۆماسی و نێودەوڵەتیدا[٢٣].

**1911:**

شەریفە خانم؛ کچە گەورەکەی شەریف پاشا، شوو بە ساڵح بەگی پوورزای عەبدولعەزیز یامولکی دەکات کە ئەفسەری خەیالەو لە پاریس یاوەری شەریف پاشا بووە. ئەم ساڵح بەگەی زاوای، درەنگتر، شەریف پاشا لەدەست مەرگێکی مسۆگەر رزگار دەکات. شەریفە خانم دوو کوڕی دەبێت کە هەردووکیان دەبن بە ئەندازیار، یەکێکیان کچی تۆسۆن پاشای ناودار دەخوازێت.

**1912:**

-لە لایەن تورکە ئیتحادییەکانەوە تاوانبار دەکرێت بەوەی کە سەرۆك وەزیران، مەحموود شەوکەت پاشای (الصدر الاعظم)ی کوشتووە، لە ئەستەمبوڵ بێ ئەوەی خۆی لەوێ بێت (غیابیا) حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەردەکەن.

-ئیتحادییەکان (کەمال) ناوێك دەنێرن بۆ پاریس بۆ ئەوەی شەریف پاشا بکوژێت. کاتێ دەگاتەماڵی شەریف پاشا، ساڵح بەگی زاوای شەریف پاشا (مێردی شەریفە خانم) کە یاوەری خەزووری خۆیەتی، لە "تاوانبار" دەستوبردتر دەبێت و دەسبەجێ نێردراوەکە دەکوژێت[24].

-ژەنراڵ شەریف پاشا لە ژمارە (47)ی گۆڤارەکەی خۆیدا نامەیەکی پیرۆزبایی بە زمانی فەرەنسی بە بۆنەی دامەزراندنی (جەمعیەتی هیوای طەلەبەی کوردان) بڵاودەکاتەوەو داوا لە گەلی کورد دەکات کە خەبات پتەوتر بکەن بۆ ئەوەی "لە دەست ئەو بەڵایەی وڵاتەکەمان رزگارمان بێت کە ناوی ئیتیحادو تەرەقییە". لە هەمان وتاردا پیرۆزبایی لە دەرچوونی گۆڤاری (رۆژی کورد) دەکات لە ئەستەمبوڵ کە ئۆرگانی کۆمەڵەی هیوای کوردانە.

### سەرەتای ١٩١٤:

-شەریف پاشا لە حکوومەتی ئینگلیزەکان نزیك دەکەوێتەوە بۆ چارەکردنی کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا، بەڵام کەڵکیان لێ وەرناگرێ.

-لەگەڵ پێرس کۆکس، باڵوێزی بەریتانیا لە پاریس، کۆدەبێتەوە، ئامادەیی خۆی نیشان دەدات بۆ هاوکاریکردنی حکوومەتی بەریتانیا لە بارەی نەخشەدانانێك بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا. "کورد لایەنگیری دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەبێت لە جەنگدا، بە مەرجێك ئەگەر هاوپەیمانەکانیش بەڵێن بدەن کە کێشەی کورد چارەسەر دەکەن"[٢٥].

### ناوەڕاستی ١٩١٤:

-حزبە ڕادیکاڵەکەی هە ڵدەوەشێنێ. کاتێ جەنگیش دەست پێدەکات، حکوومەتی تورکیا دەچێتە پاڵ ئەڵمانیا دژ بە وڵاتە هاوپەیمانەکان، ژەنەڕاڵ شەریف پاشا دژی ئەم کارەی ئەنوەر پاشا دەنگ هەڵدەبڕێت و لەگەڵ دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دژ بە تورکیاو ئەڵمانیا دەوەستێت.

-لەبەر ئەوەی دەزانێت کە جەنگ دەست پێدەکات و دەوڵەتە هاوپەیمانەکان سەرقاڵی جەنگ دەبن، شەریف پاشا بۆ ماوەی (٥٤) ساڵ "دۆسیەی کورد" لای خۆی دادەخات.

### کۆتایی ١٩١٤-١٩١٨:

ژەنەڕاڵ شەریف پاشا لە ماوەی چوار ساڵی جەنگدا لە سیاسەت و خەباتی سیاسی مەیلە و دوور دەوەسێت.

خۆی و ژنەکەی، کە هەردووکیان زۆر دەوڵەمەند بوون، لە پاریس، دوو سێ خانووی هاوینە و زستانەی خۆشیان لە بۆلڤاری هۆسمان و باڵزۆدا هەبوو. هاوینان، گەلێك جاران

بەهارانیش، دەچوونە (مۆنتــی کـارلۆ) کـە شـەریف پاشـا پیـی دەوت (مـۆن کیـف واتـە( کەیفی من) .

شەریف پاشا، بــە دریژایـی چـوار سـالی جـەنگ، دوور لـە سـەداو هـەرای جـەنگ، لـە (مۆنتـی کـارلۆ) سـەرقالی قومــارکردن بــوو. ژیــانی خــۆی لــەناو (کلــۆب نــایت) و (قومارخانە)و بارەکاندا بەسەربرد. لەبەرئەوەی قۆز و ریکپۆش و کەشخە بوو، فەرەنسیەکان پیبیان دەوت (شەریف لۆبۆ) واتە (شەریفە قۆز)(٢٦).

## سەرەتای ١٩١٨:

-ژەنەرال شەریف پاشا دەکەویتە سەر خویندنەوەی ئەو کتیبانەی کوردناسـە فەرەنسـیو ئینگلیزەکان لە بـارەی کوردسـتان نووسـیویانە، هـەروەها کۆکردنـەوەی زانیـاریی زیـاتر و پەیداکردنی بەلگەنامەی باوەرپیکراو لە بارەی میژووی کورد و کوردستان. سەرەتای نوقتـە گۆرانیك لە بیرکردنەوەی سیاسییانەی شەریف پاشا روودەدات: لە پان عوسمانیزمـەو بـەرەو ناسیونالیزمی کوردو کوردایەتی(٢٧).

-پیوەندی دەبەسـتیت بـە سـەرکردە چـەکدارەکانی کوردسـتان: سمکـۆی شـکاك، شـیخ مەحموودی نەمر، سەید تـەهای نـەهری.. راویژیـان لەگـەڵ دەکـات لـە پینـاو دامـەزراندنی دەولەتیکی سەربەخۆی کوردی(٢٨).

## مانگی ٦/١٩١٨:

لە شاری مارسیل، لە باشووری فەرەنسا، چاوی بە سیر برسی کۆکس دەکەویت، کیشەی کوردی بیردەخاتەوەو داخوازیی لیدەکات کە پیویسـتە بـەریتانیا لـە داخوازییـەکانی گـەلی کورد بکۆلیتەوەو "چارەنووسی کورد" دەستنیشان بکات(٢٩).

**١٩١٩/٢/٢:**

ژەنەڕاڵ شەریف پاشا، دەگاتەوە شاری پاریس و خۆی بۆ "پرۆژەیەك" ئامادە دەكات[٣٠].

**١٩١٩/٢/٦:**

نامەیەكی تایبەت لەمەڕ خواستەكانی نەتەوەی كورد، لە پاریسەوە، بۆ سەرۆكی كۆنگرەی ئاشتی دەنێرێت.

**سەرەتای ١٩١٩:**

-خێزانی شەریف پاشا، ئەمینە خانم (١٨٦٨-١٩٢٦) بۆتە سەرۆكی (كۆمەڵەی تەعالیی ژنانی كورد) كە یەكەمین ڕێكخراوی تایبەتی ئافرەتانەی كوردییە و سەر بە (كۆمەڵەی تەعالیی كوردستان) بووە لە ئەستەمبوڵ[٣١].

-(ویلسن)ی سەرەك كۆماری ئەمەریكا لەو ڕۆژانەدا چواردە بەندەكەی خۆی بلاوكردبۆوە كە بە پێی ئەم دەستوور و بەڵگەیە هەموو قەومێك مافی داواكردنی سەربەخۆیی پێ درابوو[٣٢].

**١٩١٩/٣/١:**

-ژەنەراڵ شەریف پاشا، لە پاریس، لە شەقامی مێسین لە خانووی ژمارە (٢٢)، خۆی ئامادە دەكات بۆ ئەو كۆنفرانسە نێودەوڵەتییەی كە چارەنووسی نەتەوەكانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دیاریی دەكات.

-شێخ عەبدولقادری كوڕی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان، بە ناوی (كۆمەڵەی تەعالیی كوردستان) لە ئەستەمبوڵ، لە ڕێگای كۆمیسارییای ئەمریكی و ئینگلیزی و فەرەنسییەوە لە ئە ستەمبوڵ، ڕادەگەیەنن كە شەریف پاشا بۆی هەیە لە

كۆنفرانسە نێودەوڵەتییەکەدا ببێتە نوێنەری داخوازییەکانی گەلی کورد. لە هەمان کاتدا نامەشیان لەم بارەیەوە بۆ ئەنجوومەنی کۆنفرانسەکە نووسی[٣٣].

-لە هەمان کاتدا، لە کوردستانی عیراقیشدا، شێخ مەحموود مەزبەتەیەکی بە ئەهالی و عەشایەری کورد مۆرکرد، کە بە پێی ئەمە، شەریف پاشای کوردی دانیشتووی پاریس کرا بە نوێنەری کوردەکان لە (کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس) بۆ داواکردنی حقووقی قەومیی کورد. ئەم مەزبەتەیە بە قەڵەمی ڕەفیق حیلمی، لە ماڵی حوکمدارێك لە سلێمانی، بە بەرچاوی مێجەر نوئێڵەوە نووسراو لەگەڵ نامەیەك بە ڕەشید زەکی کابان و (سەید ئەحمەدی بەرزنجی)یەوە ڕەوانەی پاریس کرا. بەڵام بە داخەوە، ئینگلیزەکان ئەم دوو نوێنەرە کوردەیان لە حەڵەب ڕاگرت و نەیانهێشت مەزبەتەکە بگاتە پاریس[٣٤].

**١٩١٩/٣/٢٢:**

-پێشکەشکردنی (یاداشتنامەیەك لە بارەی داخوازییەکانی گەلی کورد) بە زمانی فەرەنسی، ئەو یاداشتنامە ناودارەی کە تێیدا ژەنەراڵ شەریف پاشا بۆ یەکەمین جار داخوازیی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکات بۆ کورد لە کۆنفرانسی نێودەوڵەتییانەی ئاشتی، کە لە پاریس لە پێناو دیاریکردنی چارەنووسی گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەسترا. ئەم یاداشتنامەیە نەخشەیەکی کوردستانی گەورەیشی لەگەڵدا بوو[٣٥].

-سەرۆکی ئەمریکا (وڵسۆن)، لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (لوید جۆرج)، پێکرا لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا (کلیمەنصۆ) بە وردی لەم یاداشتنامەیە دەکۆڵنەوە.

-عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، لە گۆڤاری ژین لە ژمارە (٢١)دا، لە لاپەڕە (١٥-١٦)، شیعرێك پێشکەش بە ژەنەراڵ شەریف پاشا دەکات و بەناوی گەلی کوردەوە پشتگیری لە هەڵوێست و داخوازییەکانی ناوبراو دەکات و بە نوێنەری ڕاستەقینەی گەلی کوردی لە قەڵەم دەدات. ئەمە، نیشانەی ئەوەیە کە شەریف پاشا لەناو ڕووناکبیر و شاعیرانی کورددا، لایەنگیری زۆری هەبووە.

-ئەم هەڵوێستە گرنگ و ڕووداوە سیاسییە مەزنەی شەریف پاشا، لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیو عەرەبیو ئەرمەنیو فارسیو تورکیو ئینگلیزیو فەڕەنسییەکاندا دەنگ دەداتەوە. گۆڤاری کوردستان (ئەستەمبوڵ ١٩١٩-١٩٢٠)، لە ژمارەکانی (٤،٥،٦) لە ژمارە (٩)ی ڕۆژی (١١)ی حوزەیرانی ١٩١٩دا بەشی یەکەمی یاداشتنامەکەی بە زمانی تورکی بلاوکردۆتەوە؛ هەروەها ژمارەیەکی گۆڤاری ژین (ئەستەمبوڵ ١٩١٩) بایەخێکی تایبەتی داوەتە ئەم ڕووداوە مێژووییە گرنگە.

-لە ڕیزی ڕۆژنامە تورکییەکاندا، ڕۆژنامەی إقدام (١٨٩٢-١٩٢٠)لە زۆربەی ژمارەکانی ئەو کاتەدا بە فراوانی باسی کردووە، لەوانە: لە ڕۆژانی (١٦ی نیسانی ١٩١٩، ٢ی شوباتی ١٩١٩)، ژمارەکانی (٧٩٦٨)، (٧٩٢٦)، (٧٩١٦)، (٧٩٦٨)، ٧٨٩٥). بە فراوانی باسیان کردووە[٣٦].

**٢٦/٥/١٩١٩:**

-شەریف پاشا برووسکە بۆ ڕووناکبیر و ڕێکخراوەکانی کوردستان دەکات: ئامادەیە کە بۆ پاراستنی مافە نەتەوەییەکانی کوردو وەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی کورد، هاوکاری لەگەڵ عارف پاشای کورد بکات.

-عارف پاشا، لە قاهیرە، لە لایەن دەستەیەکی کوردانەوە، لە ڕێگەی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانەوە هەڵبژێردراوە کە بچێت بۆ پارس و لەگەڵ شەریف پاشا تەقەلایان یەك بخەن[٣٧].

کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، لە ئەستەمبوڵەوە ئەندامێکی چالاکی خۆی ناردووە بۆ پاریس بە ناوی (فەخری بەگ)، بۆ ئەوەی یارمەتیی شەریف پاشا بدات و لە کاروبارەکانیدا هاوکاریی بکات[٣٨].

-کوردەکانی تورکیاو کۆمەڵە سیاسییەکانی کورد لە ئەستەمبوڵ توانیبوویان بە ناوی خۆیان و هەموو کوردەکانەوە وەکالەتنامە بۆ شەریف پاشا بنێرن و بیکەنە نوێنەری خۆیان

لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس. ئەمە هەنگاویکی گەورە بوو کە لە لایەن (شەریف پاشا)وە بەرەو ئیستیقلال و سەربەخۆیی کوردستان هاویژرا[39]. گرنگترین ئەو کۆمەڵە سیاسییانەی، جگە لە شیخ مەحموود، پشتگیری شەریف پاشایان کردبوو، ئەمانە بوون: (تەعاون و تەرەقی کورد)،( تەعالیی کوردستان)، (هیوا)، (تەشکیلاتی ئیجتماعی)، (فیرقەی دیموکراتی کورد)، (جەمعیەی ئیستقلالی کوردستان).

-رقەبەرایەتیی ئەرمەنییەکان لەگەڵ شەریف پاشا، لەسەر دیاریکردنی سنووری ئەرمەنستان و کوردستان توندوتیژتر دەبیت.

**١٩١٩/٧/٢٩ و ١٩١٩/١٠/٩:**

-شەریف پاشا دوو نامە دەنیریت بۆ رۆبەرت فانسیتارتی سکرتیری یەکەمی بالویزخانەی بەریتانیا لە پاریس بۆ ئەوەی بیخاتە بەردەم بلفۆری وەزیری دەرەوەی بەریتانیا[٤٠]. لەم دوو نامەیەدا روونی کردۆتەوە کە کورد ئەویان بە "سەرۆك دەولەتی کورد" هەلبژاردووە.

**١٩١٩/١٢/٢٠:**

-شەریف پاشا ریککەوتننامەیەکی دوو قۆلی لەگەڵ نۆبار پاشای ئەرمەنییەکان مۆردەکات و بەپیی ئەم ریککەوتنە، دەست لە چەند شاریکی کوردی هەلدەگریت بۆ نۆبار پاشای ئەرمەنی(٤١).

-وازهینان لە ئایدیۆلۆژیەتی پان عوسمانیزم و داواکردنی دەولەتیکی کوردی، وەك لە لای شەریف پاشادا دەبینین، وای کرد کە ئەو توخمانەی جموجولی ناسیونالیزمی کوردی پیکدەهینن، وردە وردە جیگەی خۆیان بکەنەوە[٤٢].

**١٩٢٠/٣/١:**

بۆ دووەم جار یاداشتنامەیەکی دیکە پێشکەش بە ئەنجومەنی باڵای کۆنفرانسەکە دەکات لەگەڵ نەخشەیەکی نوێی کوردستان[٤٣].

**١٩٢٠/٣/٢٣:**

وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نامەیەك بۆ مەندووبی سامی لە بەغدا دەنووسێت، تێیدا روون دەکاتەوە کە حکوومەتی بەریتانیا ئامادەیە دەوڵەتێك بۆ کورد دروست بکات بە سەرۆکایەتیی شەریف پاشا، بەڵام ئایا ئێوەی حکوومەت کەسی دیکەی شایستە دەبینن کە ببێتە سەرۆکی ئەو دەوڵەتە کوردییە؟[٤٤].

**١٩٢٠/٣/٢٥:**

-وەڵامی مەندووبی سامی لە بەغداوە: "هیچ کوردێك نییە کە بتوانێ بەناوی هەموو کوردستنانەوە قسەبکات"، "کورد بە شێوەیەکی گشتی هەستی عەشایەرییان هەیە، نەك نەتەوەیی"[٤٥].

-پەیدابوونی جیاوازیی بۆچوون و ئایدیۆلۆیای دژ بە یەکتر لەناو کورداندا. بۆ نموونە، شێخ عەبدولقادری شێخ عوبەیدوللای نەهری دەستی کردە برووسکە ناردن بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس و داوای ئۆتۆنۆمی کرد لە جیاتی پێکهێنانی دەوڵەتە سەربەخۆکەی شەریف پاشا.

-هەر یەکێك لە فەرەنسا و بەریتانیا ریگا چارەی جیاواز و دژ بە یەکیان هەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد[٤٦].

**١٩٢٠/٤/٢٧:**

ژەنەراڵ شەریف پاشا، لە ناکاو، نامەیەك بۆ وەفدی بەریتانیا لە پاریس دەنێریت و بۆی روونده‌کاتەوە کە چیتر سەرۆك وەفدی کوردان نابێت و نوێنەرایەتی کوردان ناکات لەم

کۆنفرانسـەدا: ئەمـەش لەبـەر ئـەو ناکۆکییانـەی کـە لەگـەڵ شـیخ عـەبدولقادری سـەرۆك کۆمەڵەی کوردان لە ئەستەمبول هەیەتی(٤٧).

**١٠/٨/١٩٢٠:**

-ئیمزاکردنی پەیمانی سـیڤەر لـە نیـوان تورکیـاو دەولەتـە هاوپەیمانـەکاندا کـە لەسـەر بنچینەی داخوازییەکانی ژە نەرال شەریف پاشا هەڵچنرابوو(٤٨).

-شەریف پاشا، بە یاداشتنامەکەی خۆی، بـەندی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی پەیماننامەکـەی بـۆ سـەربەخۆیی کوردسـتان و دامـەزراندنی دەولـەتی کـوردی تـەرخان کردبـوو. تورکیـاش بـۆ دامەزراندنی ئەو دەولەتە کوردییە رەزامەندیی خۆی پیشان دابوو(٤٩).

**١٩٢١:**

تورکیاو هاوپەیمانەکان، بە پیی پەیمانی سیڤەر، کە دابوویانە کورد بۆ ئەوەی دەولەتیان بۆ دروست بکەن، لە گفتوگـۆو مشـت و مـردان. ونسـتۆن چـەرچل بـیر لـەوە دەکاتـەوە کـە دەولەتیك بۆ کوردو تورکمان و ئاشووری دابمەزرینیت لە باکووری عیراقدا(٥٠).

**١٩٢٢:**

لە کاتیکدا شۆرشی شیخ مەحموود لە کوردستانی عیراقدا دژی ئینگلیز هەڵگیرساوەو لایەنگیریی تورکیای پی خۆشە، لە کوردستانی تورکیاشدا نوینەرەکانی شۆرشی کـورد لـە تورکیا -ئەوانیش رادەگەیەنن کە "نایانەوێ کوردستان لە تورکیا جودا ببیتـەوە". نوینـەرە کوردەکانی هەموو شـارەکانی بـەتلیس و وان و دیاربـەکرو مـەلاتیان و دەرسـیم و ئورفـە.. ئەمەیان راگەیاند.

**٢٣/٧/١٩٢٣:**

لە کۆنفرانسی (لۆزان)دا، دەولەتـە هاوپەیمانـەکان دووای ئـەوەی بۆیـان دەرکـەوت کـە کوردەکـان نایانـەوێ لـە تورکیـا جـودا ببنـەوەو تورکیـاش بـەلین دەدات کـە مافـە

نەتەوەییەکانی کوردەکان وەدی بهێنێت؛ لە پەیماننامەی (لۆزان )دا بەندەکانی (٦٢و ٦٣و ٦٤)ی پەیماننامەی سیڤەریان هەلوەشاندەوەو خەونە جوانەکەی شەریف پاشایان زیندەبەچاڵ کرد.

شەریف پاشا وەسیەت دەکات کە دووای مردنی خۆی[٥٢]، لاشەکەی بسووتێنن و خۆلەمێشەکەی فڕێ بدەنە دەریاوە[٥٣].

:١٩٢٤

سزا خانمی کچی شەریف پاشا شوو بە کوری چەرکەس مێرلیوا نازم پاشا (عەبدولرەحمان پووخ) دەکات. لەم پیاوە دوو منداڵیان دەبێ.

:١٩٢٦

کۆچی دوایی خێزانەکەی شەریف پاشا، ئەمینە خانم، لە پاریسەوە تەرمەکەی دەگوازنەوە قاهیرە.

سالآنی ١٩٣٠:

-کۆتایی سالآنی بیستەکان و سەرتاسەری سالآنی سییەکان لە ژیانی شەریف پاشادا نادیار و نائاشکرا ماوەتەوە، هێندە نەبێ: دووای مردنی ژنەکەی (ئەمینە خانم)، ماڵ و سامانی خۆی، هەمووی، لە (مۆنتی کارلۆ) لە قومار و شەوبیری و شەوانەژی و سەرخۆشی بەهەدەر دەدات. تا وای لی دیت سکرتێرەکەی خۆی (مەلەك خانم) دەخوازێت لە مەلەك خانم کچێکی دەبێ بەناوی (کەریمە) کە لە ١٩٤٨ شوو بە کۆنت (پیکۆرینی مانزۆنی)ی ئیتالیا لە شاری (کاتانزارۆ) دەکات لە خوارووی ئیتالیا.

-شەریف پاشا، کاتێ لە پاریس بە تەواوەتی ئیفلاس دەکات و دەکەوێ؛ کەریمەی کچی لە ماڵەکەی خۆی بەخێوی دەکات و سەرپەرشتیی ژیانی دەکات[٥٤].

**١٩٣٦:**

**لە مۆنتی كارلۆ دەژیت. لە ریگەی قونصولی ئیتالیــاوە لـە شـاری نیـس لـە فەرەنسـا پەیوەندییەكی نهینی لەگەل دكتاتۆری ناوداری ئیتالیا (مۆسۆلینی) دەبەستێ.**

**١٩٣٦/١٢/٨:**

**نامەیەكی نهینی بۆ مۆسۆلینی دەنیرێ.**

**١٩٤٢/٦/١٢:**

**حكوومەتی ئـەلمانیا دەعوەتـی كـردووە بـۆ پـاریس؛ تـا ٦/٢٥ لـە پـاریس دەعوەتـی حكوومەتی ئەلمانیا بووە. لەو ماوەیەدا گفتوگۆی هەبووە لەگەڵ حكوومـەتی ئـەلمانیا لـە بـارەی كیشـەی نەتـەوەی كـوردو پـەیوەندیی ئـەم كیشـەیە بـە جـەنگی دووەمـی گیتـیو سویندخۆرانەوە.**

**١٩٤٢/٧/٢٧:**

**نامەیەكی دیپلۆماسی لە بارەی كیشەی كورد و پەیوەندیی بە جەنگ و سویندخۆرانەوە بۆ مۆسۆلینی دەنیریت.**

**١٩٤٢/١٢/١٦:**

**نامەی دووەم بۆ هەمان مەبەست بۆ مۆسۆلینی دەنیرێ[٥٥].**

**١٩٤٥/١١/٢٩**

**شـەریف پاشـا، بـە تەمـەنی (٨٠) سـاڵەی خۆیـەوە، دەچیـت سـەریك لـە باڵویزخانـەی بـەریتانیا دەدات لـە قاهـیرە. لـەوێ لەگـەڵ ولتـەر سمـارتی بـاڵویزی بـەریتانیا لـە قاهـیرە كۆدەبیتـەوە و داوای لیدەكـات كـە (ئۆتۆنۆمـی بدریتـە كـورد لـە چوارچیـوەی دەوڵـەتی**

عیراقدا)[٥٦]. ئەم رووداوە، کار لـە شـاعیری کـورد، عـبدالـرحمان بـەگی نفـووس دەکـات و شیعریك بۆ ئەم هەلویستەی ژەنەرال شەریف پاشا دەنووسیت[٥٧].

**١٢/١٩٤٥:**

ژەنـەرال شـەریفا پاشـا، چـەند هەفتەیـەك دووای ئـەم داخوازییـە، کـە ئـاخرین خـەون و ئومیدو تیکۆشانی بوو، دەگەریتەوە مالی کچەکەی لە ئیتالیا، لە شاری (ناپۆلی).

١٩٥٠: شەریف پاشا دەچیتە (رۆما) لە مالی کچەکەی دەژیت، کە پاشان دەگوازنـەوە شاری کالابرا.

**٢٢/١٢/١٩٥١:**

ژەنەرال شەریف پاشا، لە تەمەنی (٨٦) سالیدا، لە شـاری نـاپۆلی لـە ئیتالیـا کۆچـی دووایی دەکات.

سزا خانم و شەریفە خانمی کچی شەریف پاشا، لەگەلّ سـالح بـەگی زاوای، بـە واسـیتەی ئـامۆزای ئەمینـە خـانم (کـە مـەلیك فـارووق بـووە) تەرمەکـەی دەهیننـەوە میسـر؛ وەسـیەتنامەکەی شـەریف پاشـا فـەرامۆش دەکـەن: لـە جیـاتی ئـەوەی بیسـووتینن‌و خۆلەمیشەکەی فریّ بدەنە دەریاوە، لە میسر دەینیژن. تا ئیستا نازانین لەکویّ؟[٥٨].

## سەرچاوە:


١-رۆهات ئالاكۆم: دە سال لە ژیانی جەنەرال شەریف پاشا لە ستۆكهۆلم، گۆڤاری مامۆستای كورد، ژمارە (٢٧) ستۆكهۆلم: پایزی ١٩٩٥.

٢-عەبدولعەزیز یامولكی: بنەماڵەی خەندان، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (٢)، سلیمانی: ١٩٩٧، ل ٩٢-١٢٠.

٣-محمد امین زكی: تأريخ السليمانيه- بغداد: ١٩٥١، ل ٢٠٥-٢١٠، ٢٥٧.

٤-بۆ شەجەرەی بنەماڵەی خەندان، بڕوانە: عەبدولعەزیز یامولكی‌ن سەرچاوەی ژمارە (٢). هەروەها ئەكرەم مەحموود سالحە رەشە: شاری سلیمانی، بەرگی یەكەم، بەغدا: ١٩٨٧، ل ٤٧٩و ٤٩٢.

5- mech rou Tiette, Organ du Parti Ottoman Sous La Patronage de G. cherif Pacha, N. 47, Oct. 1913.

6-Hamit BOZARSLAN: Le Probleme National Kurde en Turquie, Diplome, Paris: 1986.

٧-سەرچاوەی ژمارە دووەم.

٦-سەرچاوەی ژمارە دووەم.

٩-سەرچاوەی پێشوو.

10-Hamit Bozarsla: L Opposition Libreal dans L Empire Ottoman, Diplome Sous La diredtion def. Furet, Purit: 1987.

هەروەها بڕوانە: د. فەرهاد پیربال: شەریف پاشا، گۆڤاری گوڵان، ژمارە (١١٩)، هەولیر

هەولیر ١٩٩٧، ل ٢١-٢٣.

11-Osmanli, Journal edite Par. A. Djewdet N. 13- 29, 1902.

١٢-عەبدولعەزیز یامولکی: بنەماڵەی خەندان، گ. پەیڤین، ژمارە ٢، سلیمانی: ١٩٩٨، ل ٩٩-١١٥.

١٣-حسن توفیق افندی مکتوبچی، سالنامە ١٣٢٥ هجری ولایت موصل، بە زمانی عوسمانلی، ل ٦٧ و ٧١.

١٤-عەبدولعەزیز یامولکی، سەرچاوەی ژمارە (٢) لەم باسەدا.

١٥-رۆهات ئالاكۆم: دە ساڵ لە ژیانی جەنەراڵ شەریف پاشا، مامۆستای کورد، ژ ٢٧، ستۆکهۆلم: ١٩٩٥.

١٦-میر بصری: اعلام الكورد، ریاچ الریس للكتب و النشر، لندن: ١٩٩١.

١٧-بلەچ شیرکۆ: کیشەی کورد ،و: حەمەی حەمە باقی، چ٣: ١٩٩٢، ل ٥٠.

١٨-د. جەبار قادر: د. عەبدوڵلا جەودەت، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٣٢)، هەولیر: ل ٩. هەروەها بروانە: دیوانی پیرەمیرد، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم: چاپخانەی خاك، سلیمانی: ٢٠٠٠، ل ٢٣ و ٢٧.

١٩-د. بلەچ شیرکۆ القضیة الكوردیة، قاهرة: ١٩٣٠، ل ٥٠-٥٢.

20-Chris Kurtshera: Le Mouvement national Kurde, Paris: 1979, p. 24-45, 58.

21-G. Groc - 1. Caglar: La Presse francaise de Turquie, ed. lsis, Istanbul. S. D. ;. 194.

٢٢-د. فەرهاد پیربال: رۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە (١)، هەولیر: ١٩٩٨، ل ٤١-٥٦.

23-Hamit Bozarslan: La Question Kurde presse de Sciences po, paris: 1997, p. 120>

٢٤-عەبدولعەزیز یامولکی: ل ٩٩-١١٥.

25-Chris Kutshera: La Mouvement, p. 59.

هەروەها بروانە رەفیق حیلمی: یاداشت، بەشی دووەم، بەغدا: ١٩٨٨، ل ٤٦٦.

26-Chris Kutshera: Le Mouvement National Kurde, paris: 1979.

٢٧-لـه بـارەی گەشـەکردنی ئایدیۆلۆژیـەتی شـەریف پاشـا لـە پـان عوسمانییـەوە بـــۆ "کوردایەتی" بروانە دیپلۆمەکەی حەمید بۆز ئارسلان کە بە زمـانی فەرەنسـی لـە پـاریس ئەنجامی داوە:

-Hemit Bozarslan: L, Opposition Liberal dans L Empire Ottomon 1908-1914, Diplome preparee sous la direction de F. Furet, Paris: Juin 1987 0

28-M.M. Van Bruinessen: Agha، Shaikh and State on the social and political organization of Kurdistan, Ultech: 1978, p. 369- 374.

٢٩-رەفیق حیلمی: یاداشت، بەشی دووەم، بەغدا: ١٩٨٨، ل ٤٦٦، ٢٠٥.

٣٠-رۆژنامـەی اقـدام (١٨٩٣-١٩٢٠) کـە بـە زمـانی عوسمـانلی لـە ئەسـتەمبول دەردەچـوو، ژمـارە (٧٨٩٥)ی رۆژی ٢ی شـوباتی ١٩١٩، ل (٢)، وتـاری (شـەریف پاشـا پاریسه مواصلت ایتی).

٣١-رۆهات ئالاکۆم: دە سال لە ژیانی. هـ.ل.

٣٢-رەفیق حیلمی: یاداشت، بەشی دووەم، ل ١٩١.

٣٣-زنار صلوبی: فی سبیل کوردستان، ترجمە الی العربیە: د. رضوان علی، منشورات رابطة کاوا، بیروت: ١٩٨٧، ل ٦٣.

٣٤-رەفیق حیلمی: یاداشت، بەشی دووەم، ل ٦٥و ١٩٠.

35-Memorandum Sur les Revandications du peu ple Kurde, Paris: 1919. 15 pages.

ئەم یاداشتنامـەیە تەرجەمـە کراوەتـە سـەر زمـانی کـوردی و لـە ژمـارە (٢)ی گۆڤـاری (رابوون) لە ستۆکهۆلم لە سالی (١٩٩١)دا بڵاوکراوەتەوە، ل ٦٣-٧٤.

٣٦-فەرهاد پیربالْ: زنجیرەی ژیاندنەوەی نووسراوە عوسمانییـەکان ژمـارە (٢)، شـەریف پاشاو کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس، گۆڤاری یەکگرتن، ژمارە (١٣)، کۆپنهاگن: ١٩٩١، ل ١٠٠-١٠٤.

٣٧-د. فەرهاد پیربال: گۆڤاری کوردستان، بلاوکراوەکانی دەزگای گولان، ژمارە (١٣)، هەولیر: ١٩٩٨. بروانە پیشەکی و ژمارە ((٩)ی گۆڤارەکە، کە لە (١١)ی حوزەیرانی (١٩١٩)دا بلاوکراوەتەوە.

٣٨-د. ولید حمدی: الکرد في الوثائق البریطانیة، لندن: ١٩١٩، ل ١٨٣.

٣٩رەفیق حیلمی: یاداشت بەشی یەکەم، ل ١٩-٢٠.

٤٠-عەبدولعەزیز یامولکی، ل ١١٣، هەروەها محمد صالح زیباری: ژەنەرال شەریف پاشا، گۆڤاری گازی، ژمارە (٢٨)، دهۆك: ١٩٩٧، ل ٢٣-٢٤.

**41=Le Temps, Journal parisien, 10 Mars 1920, Paris: 1920.**

هەواڵەکە بە زمانی تورکیش لە رۆژنامەی (پیام صباح)ی ئەستەمبولیشدا بلاودەکریتەوە. هەروەها بروانە: البروفیسور م.ا ٠هسرتیان: کردستان ترکیا بین الحربین، ترجمة د. سعدالدین ملاو باقی نازی، منشورات رابطة کاوا رقم ١١، دار الکاتب، بیروت: ١٩٨٧، ل ١٦.

**42-Hamit Bozarslan: Tradition alisme ou Nationalisme, in "Cemoti", N, 6, F. N. S. P,. Centre De Recherches Internationales, Paris: 1988, p. 35- 532.**

**43-Christion More: Les Kurdes aujourd hui L. Harmattan, paris: 1984. p. 61.**

٤٤-ئەم بەلگەنامەیە لە کتیبەکەی (د. ولید حمدی) بلاوکراوەتەوە: الکرد فی الوثائق البریطانیة، ل ٥و ٩٢.

٤٥-هـ. س. ل ٩٨.

٤٦-فوئاد حەمە خورشید: ژەنەرال شەریف پاشاو کۆنگرەی ئاشتی، گۆڤاری رەنگین، ژمارە (٨٩)، بەغدا: ١٩٩٦، ل٧.

٤٧-د. ولید حمدی: ل ٣٤١-٣٤٤. هەروەها بروانە محمد صالح زیباری: ژەنەرال شەریف پاشا، گۆڤاری گازی، ژمارە (٢٨)، دهۆك: ١٩٩٧، ل ٢٣-٢٤.

**48-Les Kurdes et Le Kurdistan, sous la direction de Gerard CHALIAND, ed., PCM Paris: 1978. 64.**

**49-B. CHIR GUH: La QUESTION Kurde, Caire: 1930, p. 23-29.**

دەقی ئەم بەندانەی تایبەتن بە دامــەزراندنی دەولـەتی کوردییـەوە لـە لایـەن مـامۆسـتا (رەفیق حیلمی)یەوە تەرجەمەی کوردی کراون: یاداشت، بەشی یەکەم، لاپەرە ١٩-٢٠.

٤٠-د. ولید حمدی: الکرد فی الوثائق البریطانیة، ل ١٢٣-١٢٩.

51-A, BEDIRKHAN: LA QUESTION KURDE, PARIS: 1959, p. g.

هەروەها بروانە: م. أ. هسرتیان: کردستان ترکیا بین الحربین، ل ٥٤.

52-Les Kurdes et Le Kurdistan Paris: 1978.

٥٣-عەبدولعەزیز یامولکی: ل ١٠١.

٥٤-سەرچاوەی پێشوو: ل ١٠١.

55-Mirella GALLETI: Deux Lettrs de Cherif Pacha a Benito MUSSOLONI in Etudes Kurdes, N 2, Paris: 2000, P. 65- 82.

٥٦-د. ولید حمدی: الکرد فی الوثائق البریطانیة، ل ٢٤٨-٢٥١

هەروەها بروانە: د. احمد عثمان ابوبکر: مزکرە الی وفـود الحلفـاو مـن الموفـد الکـردی شریف پاشا، مجلە (کاروان) عدد ٣٩، اربیل: کانون الاول ١٩٨٥.

٥٧-محمود احمد محمد: بەشێك لـە دیوانـی ئـەورەحمان بـەگی بابـان، بـەغدا: چاپخانـەی زەمـان، ١٩٨٩، ل ٨١.

٥٨-عەبدولعەزیز یامولکی: لاپـەرە: ١٠١. هـەندێ سـەرچاوە باسـی ئـەوە دەکـەن کـە ژەنەرال شەریف پاشا لە سالی ١٩٤٦دا کۆچـی دوایـی کـردووە، بـەڵام ئیمـە پیمـان وایـە (١٩٥١) دروست و پەسەندترە.

# ژەنەراڵ شەریف پاشاو
# یەکەمین گۆڤاری کوردی بە زمانی فەڕەنسی

**مەشرووتیەت Mechroutette**

**پاریس: (١٥/١٠/١٩٠٩ تا ٢/١٩١٤) ٥٥ ژمارە**



# Mècheroutiette

"CONSTITUTIONNEL OTTOMAN"

Organe du Parti Ottoman " l'Entente Libérale "

sous le patronage du

Général CHÉRIF-PACHA

ANCIEN SAINT-CYRIEN

GRAND OFFICIER DE LA LÉGION D'HONNEUR

ANCIEN MINISTRE DE TURQUIE À STOCKHOLM

REVUE MENSUELLE

consacrée à la Défense des Intérêts Politiques et Économiques et des Droits Égalitaires de tous les Ottomans sans distinction de race ni de religion.

La correspondance doit être adressée à l'Administration du " MÈCHEROUTIETTE " 115, rue de la Pompe, Paris (16e)

Téléphone : 639-59 et 636-23

*Les manuscrits non insérés ne sont pas rendus. La rédaction reste libre d'apporter dans les articles soumis les modifications qu'elle jugera nécessaires.*



MECHROUTIETTE

ORGANE CONSTITUTIONNEL OTTOMAN

JOURNAL MENSUEL

CHERIF PACHA

GRATUIT

GRATUIT

La Constitution en Turquie et les Agissements du Comité

**رۆژنامەکەی شەریف پاشا**

**"مەشروتیەت"**

"ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەڕەنسی " واتــە: ئـەو چالاکییـە ڕۆژنامەنووسـییەی ڕووناکبیر و ڕۆژنامەنووسە کوردەکـان کـە لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهەمـەوە بـە زمـانی فەرەنسی ئەنجامیان داوە بۆ بەرگری کردن لە بەرژەوەندیە جۆراوجۆرەکانیان، یان بۆ هـێرش کردنـە سـەر حکوومەتـەکانیان؛ هـەروەها هـەندێ جـار بـەکارهێنانی ئـەو چالاکییــە، وەك ئامرازێکی دەربڕینی ئەو داخوازییە گەلەکۆمەکییانە کە عوسمـانین، تورکیـایین، عـێراقین.. یانیش گەلێك جاران بە واتا سیاسی- ئەتنیکییەکە: کوردین.

## ئەم گۆڤارەی شەریف پاشا بۆچی بە فەڕەنسی بووە؟

هـەبوونی بەرژەوەندیـەکانی دەوڵـەتی فەڕەنسـا لـە ڕۆژهـەڵاتدا دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی حەڤدەهـەم، ڕۆژنامـەی فەرەنسـیەکان Le Mercure de france لـە ١٦٢٢ و Gazette لـە ساڵی ١٦٣١ پڕن لە زانیاریو دەنگوباسی جۆراوجۆر لـە بـارەی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانیو ژیـانی خـەڵکی ئـەوێ، تەنانـەت فەرەنسـیەکان خۆیــان بــە پارێزگــاری خــەڵکی غــەیرە موسڵمانەکانی ڕۆژهەڵات دادەنا[١].

زمانی فەرەنسی، لە ماوەی سەدەکانی ١٨ و ١٩دا لـە تورکیـای ئەوسـاتدا بایـەخێکی زۆری پێ دەدرا. کاریگەرییەکانی کولتووری فەرەنسیو شۆڕشی فەرەنسا هەر لە سـەردەمی سوڵتان سـەلیمی سێیەمەوە بەدیاردەکـەوێ[٢]. هـەر لـەو سـەردەمانەوە خـەڵکانێکی زۆری فەرەنسی لە ئەستەمبوڵ و شارەکانی دیکەی وڵاتی عوسمانیدا دەژیان. لـە کۆلیژێکـی وەك مـەدرەسـەی عەسـکەریی عوسمـانیدا Ecole Millitaire Ottomana دەیـان مامۆسـتای فەرەنسی دەرسیان دەگوتەوە، دەیانی دیکەش فەرمانبەر بوون. کتێبخانەی ئـەو مەدرەسـەیە زیاتر لە چوار سەد بەرگ کتێبی فەرەنسی و ئینسیکلۆپیدیای تێدابوو. بە کورتـی: زمـانی فەرەنسی، زمانی لە یەکترگەیشتنی نێوان وڵاتی عوسمانی و ڕۆژئاوا بوو[٣].

بۆ بەرەوانیشاندانی ئەم کاریگەرێتییەی فەرەنسا بەسەر وڵاتی عوسمانیدا هێندە بەسە ئەوە بە بیر خۆمان بهێنینەوە کە یەکەم ڕۆژنامەی بڵاوکراوەی ناو سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵی ١٧٩٥-١٧٩٦دا، بە زمانی فەرەنسی بووە، بە ناوی بۆڵتەنی دەنگوباس Bulletin des Nouvelles کە مەبەستی بڵاوکردنەوەی فەلسەفەی شۆڕشی فەرەنسی بوو، ئەمەش لە ڕێگای سەفارەتی فەرەنسیەوە لە ئەستەمبوول[٤]. یەکەم ڕۆژنامەی عوسمانیش، کە سوڵتان مەحموودی دووەم بەناوی تەقویمی وەقایع لە ساڵی ١٨٣١دا دایهێنا، لەژێر کاریگەرێتی ڕۆژنامەیەکی فەرەنسیدا لە دایك بوو کە هەمان ناونیشانی هەبوو Moniteur Officiel. ڕۆژنامە عوسمانیەکە پێنج ڕۆژ لە دووای فەرەنسیەکە دامەزرا. ئەم کاریگەرێتیەی فەرەنساو ڕۆژنامەگەریی فەرەنسا بەسەر وڵاتی عوسمانیدا، تەنانەت تا جەنگی جیهانی یەکەم، بەسەر ڕووناکبیرانی عوسمانیو بزاڤە ڕۆژنامەگەرییەکەیاندا زۆر بە زەبر بووە[٥].

نەك تەنیا نووسەرو ڕووناکبیرانی تورك فێری فەرەنسی ببوون و زمانی فەرەنسیان بەکاردەهێنا، بەڵکو ژمارەیەکی زۆری نووسەر و ڕووناکبیرانی کوردیش فێری فەرەنسی ببوون و دەیانتوانی بەکاری بهێنن و سوودی لێ ببینن ،تەنانەت هەندێکیان لە زانکۆکانی فەرەنساو سویسراو ئەستەمبوڵ بە زمانی فەرەنسی خوێندنیان تەواوکردبوو. لەو نووسەرە کوردانەی توانیان لەو سەردەمەدا فەرەنسی فێربن و سوودی لێ ببینن: د. عەبدوڵڵا جەودەت، د. ئیسحاق سکووتی، ژەنەراڵ شەریف پاشا، مەمدوح سەلیم، ڕەفیق حیلمی، میقداد- مەدحەت بەدرخان، د. کامەران بەدرخان، جەلادەت بەدرخان، حوسێن حوزنی موکریانی، د. نوورەدین زازا، عەبدولڕەحمان بەدرخان.

سوڵتان عەبدولحەمید لە مانگی شوباتی ١٨٧٦ بەملاوە سانسۆرێکی توندی خستە سەر ڕۆژنامەگەری. ئەم سانسۆرە لە شێوەی چەند بەندێکدا بڵاوکرایەوە و بووە قانوون[٦]. بەم شێوەیە ڕۆژنامەگەری تاکو ساڵی ١٩٠٨ نەیدەتوانی تخوونی سیاسەت بکەوێت و بە

ئازادی بدوێت[٧]. لە ئەنجامی سەپاندنی ئەم قانوونە دکتاتۆریەی سولتان عەبدولحەمید بەسەر ڕۆژنامەگەریدا، ڕۆژنامەگەریی فەرەنسیو تورکی لە وڵاتی عوسمانیدا کەوتە کزی، تەنیا ڕۆژنامەو گۆڤارە تەندروستیو "پزیشکی" و "هەواڵ" و هونەریو ئەدەبیەکان مانەوە. بەندی شەشەمی قانوونەکەی عەبدولحەمید لە بارەی ڕۆژنامەگەری دەڵێ: (هیچ داخوازیو سکاڵانامەیەکی تایبەتی خەڵکی ویلایەتەکان نابێت بڵاوبکرێتەوە کە گازاندە لە دەسەڵاتدارانمان بکەن و ڕەخنەیان لێ بگرن). لە بەندی حەوتەمیشدا دەڵێ: (ناوی هیچ مەڵبەندێکی مێژوویی و جوگرافی نابێ بهێنرێتە سەر زمانی ڕۆژنامە، لەوانە ئەرمینیاش).

ئەنجامیکی دیکەی ئەم دکتاتۆریەتەی عەبدولحەمید ئەوەبوو کە ڕاپەرینیکی ڕۆژنامەگەریی "کەمە نەتەوایەتیەکان" وەك یۆنانیو بولگاریو ئەرمەنی، لە نیوان ساڵانی ١٨٧٨-١٨٨٦دا، بە زمانی فە رەنسی سەری هەلدا. هەروەها هەندیکی دیکەشیان ،لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنە عوسمانیەکانی دیکە (کورد، تورك، چەرکەس" هاتنە فەرەنساو سویسرا بۆ ئەوەی لەم وڵاتانەی ئەوروپاوە، بە تایبەتی لە فەرەنساو سویسراو بریتانیاوە، دەنگی "ڕۆژنامەنووسانەی" یاخیگەری خۆیان دژ بە سولتان عەبدولحەمید بەرز بکەنەوە. لە ماوەی ١٨٩١-١٨٩٥دا شەش ڕۆژنامەی دژ بە عەبدولحەمید لە فەرەنسا سەریان هەلدا، حەوتی دیکەش لە ماوەی ١٩٠٠-١٩٠٤دا لە وڵاتانی دیکەی ئەوروپا[٨].

کەواتە: ڕۆژنامەیOSMANII ١٨٩٧-١٩٠٤ و گۆڤاری Idgihad ١٩٠٤- ١٩٣٢، یادگاری ئەو ڕۆژگارە ڕەشەی سولتان عەبدولحەمیدن. سییەمیشیان Mechroutiette ١٩٠٩-١٩١٤ بەهەمان شیوە، دەنگی یاخیگەری ڕادیکاڵانەی پاشازادەیەکی کوردە دژ بە حکوومەتی "گەنجە تورکەکانی" کە لە ١٩٠٨ بەملاوە سەرجەم خەبات و خەونەکانی کوردیان پیشیل کرد. ئەوەتا ژەنەڕال شەریف پاشا، سەرنووسەری Mechroutiette لە لاپەرە

٤ی ژمارە ٨ی گۆڤارەکەدا، خۆی باسی ئەم دکتاتۆریەتەی گەنجە تورکەکان ١٩٠٨-١٩١٤ دەکات و دەڵێ:

لە تورکیا، ئەمڕۆ هەموو بڵاوکراوەیەك پێشتر دەبێت بە سانسۆردا تێپەڕ ببێت، ئەگینا ٥ تا ٥٠ لیرە جەزای لێ دەسەنرێت. بەم شێوەیە، قۆناغی یەکەمی بزاڤی ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، پەیوەندی بە سێ ڕووناکبیرو سیاسەتمەداری گەورەی کوردەوە هەیە: د. عەبدوڵڵا جەودەت (١٩٣٢-١٨٦٩)، د. ئیسحاق سکوتی (١٨٦٨-١٩٠٢)، ژەنەراڵ شەریف پاشا (١٨٦٥-١٩٥١)؛ کە هەرسێکیان، لە دوو ماوەی جیادا لە دەست دکتاتۆریەتی دەوڵەتی عوسمانی غاریان دابووە پاریس و ژنێف. لەوێ -لە دوورەوڵاتیدا- درێژەیان بە خەباتی سیاسیانە و ڕۆژنامەنووسانەی خۆیان دەدا لە پێناو ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو حکوومەتی گەنجە تورکەکان و دامەزراندنی حکوومەتێکی ئاوهای کە دان بە مافی "کەمە نەتەوایەتیەکان" بهێنێت.

ڕۆژنامەگەریی کوردی بۆچی بە زمانی فەرەنسی بووە؟ بۆچی کورد ڕۆژنامە و گۆڤاری بەزمانی فەرەنسی دەرکردووە؟ هەر دوو پرسیارەکە، یەك وەڵامیان هەیە: چونکە پێویستیی نەتەوەی کورد بە ڕیفۆرم و هانا بردنی کورد بۆ ڕۆژئاوا، دوو داخوازیی یەکانگیری سەر بە یەك بیرکردنەوەی سیاسین. لەم بوارەشدا، د. عەبدوڵڵا جەودەت و شەریف پاشا بوون کە ئەم بزاڤە "فرانکۆفۆنەیان" لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا دامەزراند.

# مەشرووتیەت:

مەشـــرووتیەت Mechroutiette گۆڤـــارێکی سیاســـی ڕادیکـــاڵی دەســـــتووریخواز Constitutionnel بووە، شەریف پاشا لە پاریس بە زمانی فەرەنسی لە (١٥/١٠/١٩٠٩) تا (٢/١٩١٤)، ٥٥ ژمارەی لێ بڵاوکردۆتەوە[٩].

## خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە:

ژەنەڕاڵ شـــەریف پاشـا (١٨٦٥-١٩٥١) خـاوەن ئیمتیـازی گۆڤارەکـە، کـوڕی سـەعید پاشـای وەزیـر خارجیـەی عوسمـانی، بـە ڕەســەن خـەڵکی سـلێمانی، لـە بنەماڵـەی خەندانەکانن[١٠]. خوێندنی باڵای لە فەرەنسا لە قوتابخانـەی عەسـکەری لـە شـاری Saint-Cyr تەواوکردووە، کە لە فەرەنسا پێی دەڵێن Ecole Militaire. پاشان بۆتە ئامـیر فـەوج و ئینجا عەقید و لە کۆتاییدا گەیشتۆتە ژەنەڕاڵ General[١١].

ساڵانێکی زۆر، لـە سـاڵی (١٨٩٥) بـــەملاوە، وەزیـری دەوڵـەتی عوسمـانی بـووەو نوێنەرایـەتی دەوڵـەتی عوسمـانی کـردووە لـە باڵوێزخانـەی تورکیـای عوسمـانلی لـە ستۆکهۆڵم[١٢]. پاشـان، کـاتێ گەنجـە تورکـەکان لـە (١٩٠٨)دا دەوڵـەتی عوسمـانی دەڕووخێنن و حوکمیدەستووری دادەمەزرێنن، شەریف پاشا بە فەرمانڕەوایەتی ئـەوان ڕازی نابێت و لێیان هەڵدەگەڕێتـەوە. بۆیـە لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٠٩دا لـە پـاریس حزبێکـی سەربەخۆ دروست دەکات لە پێناو بەگژاچوونەوەی حوکمی دەستووری گەنجە تورکـەکان لـە

تورکیاو دروستکردنی چەند گۆڕانکارییەکی بنچینەیی لەو حوکمە دەستوورییەی ئەواندا. ئەو حزبە سیاسییە تازەیەی شەریف پاشا ناوی حزبی ڕادیکاڵی عوسمانی Parti radical Ottoman بوو کە بارەگاکەی لە پاریس بوو.

شەریف پاشا، بۆ بڵاوکردنەوەی پرۆگرام و داخوازینامەکانی حزبەکەوی، پێویستی بە ئۆرگانێك هەبوو بۆ ئەوەی بگاتە ناو خەڵك و قوتابیو ڕۆشنبیران لە تورکیا، بۆیە لە ڕۆژی (١٥/١٠/١٩٠٩)دا یەکەم ژمارەی بە ناوی مەشرووتیەت Mechroutiette (واتە حوکمی دەستووری) لە شێوەی ئۆرگانێکی چوار لاپەڕەیی بڵاودەکردەوە. پاشان لە یازدەمین ژمارە (لە ١/١٠/١٩١٠) بەملاوە، ئەم ئۆرگانەی لە شێوەی گۆڤارێکی (٥٠) لاپەڕە بڵاودەکردەوە[١٣]. شەریف پاشا تا مانگی دووی ساڵی (١٩١٤)، ٥٥ ژمارەی لەو گۆڤارە سیاسیە بڵاوکردەوە، پاشان وازی لە گۆڤارەکە هێنا و حزبەکەی خۆیشی هەڵوەشاندەوە.

لە ماوەی ساڵانی (١٩١٨-١٩١٤)دا، شەریف پاشا وردە وردە باوەڕی بە خەباتی بانعوسمانی کزتر دەبۆوە، هێدی هێدی پشتی دەکردە باوەڕی رادیکاڵی خزبەکەی پێشووی: لە بیری نەتەوەییو کوردایەتی نێزیك دەبۆوە.

لە ساڵی ١٩١٩دا، بیری کوردایەتی شەریف پاشا، لە پەرەسەندنی خۆیدا گەشتە لووتکە؛ لە مانگی مارسی (١٩١٩)دا لە کۆنفرانسی ئاشتی میللەتانی ڕۆژهەڵات، کە لە پاریس بەسترا، یاداشتنامەیەکی پێشکەش بە ئەنجوومەنی باڵای ئەو کۆنفرانسە نێودەوڵەتیە کردو داخوازی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی کرد بۆ کورد[١٤].

شەریف پاشا، هاوڕێیەکی نێزیکی مەعروف جیاوك و عەبدولڕەحمان بەدرخان و عەبدوڵلا جەودەت و ئیسحاق سکووتی و میقداد- مەدحەت بەدرخان و شێخ مەحمودی نەمر و پیرەمێردی شاعیر بوو.

## ناساندنی گۆڤارەکە:

مەشرووتیەت Mechroutiette، لە سەرەتادا لە شیوەی رۆژنامەیەکی مانگانەی چوار لاپەرەیی، بە قەوارەی (A3) دەرچوو. ژمارەی یەکەمی لە رۆژی (١٥/١٠/١٩٠١)دا لە پاریس بلاوکراوەتەوە. لەژێر ناونیشانی Mechroutietteدا بە زمانی فەرەنسی نووسراوە:

ئۆرگانی حوکمی دەستووری عوسمانییە بە سەرپەرشتی شەریف پاشا بلاودەکریتەوە. رۆژنامەیەکی مانگانەیە، تەرخان کراوە بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندییە سیاسیو ئابووریو مافە رەواکانی خەلکی عوسمانی، بێ ئەوەی گوی بدریتە نەژادو دینیان. ئەم رۆژنامەیە بە خۆرایی (بێ پارە) دەبەخشریت. هەموو نامەیەك پیویستە ئاراستەی ناونیشانی مالی ژەنەرال شەریف پاشا بکریت لە خانووی ژمارە (١٩٩) لە شەقامی Avenue ڤیکتۆر هۆگۆ بابەتە چاپکراوەکانیش بنیردرین بۆ نووسینگەی گۆڤارەکە: (٢٦، شەقامی دەلتا .Delta

لە ژمارە (١١) بەملاوە، کە لە رۆژی (١/١٠/١٩١٠)دا بلاوکراوەتەوە، "رۆژنامەکە" دەبیتە گۆڤاریکی قەوارە (٢٢× ١٥) سم، هەر ژمارەیەك لە (٥٠) لاپەرە کەمتر نییە. هەر مانگ جاریك بلاودەکریتەوە. لەسەر بەرگی گۆڤارەکەدا ئەم چەند دیرە زیادکراوە: مەشرووتیەت، ئۆرگانی حزبی عوسمانی خاوەن رەوتی لیبرالییە، شەریف پاشا خاوەن ئیمتیازیەتی. هەر بابەتیکی دەنیردریت، پیویستە ئاراستە بکریت بۆ دەزگەی مەشرووتیەت لە ١١٥ شەقامی Pompe لە پاریسی شازدە هەم.

لەم دیوو لەو دیوی بەرگی دوواوەی گۆڤارەکەدا، پەیرەوو پرۆگرامی حزبەکەی شەریف پاشا، حزبی رادیکالی عوسمانی Parti Radical; Ottoman لە (٤٤) برگەدا بلاوکراوەتەوە. رەنگی بەرگی گۆڤارەکە سەوزو زەردو سوورو جۆراوجۆرە، کاغەزەکەیشی بۆر، هەر لاپەرەیەك ٤٢ دیری تیدا نووسراوە.

## چۆن نوسخەکانی ئەم گۆڤارەمان دەست کەوت؟

تا ئێستە، هیچ سەرچاوەیەکی کوردی، بە هیچ زمانێك باسی ئەم گۆڤارە بەهادارەی شەریف پاشای کوردی نەکردووە. نوسخەکانی ئەم گۆڤارە لە پەرش و بڵاوی لە ئارشیفخانەکانی شاری پاریس کەوتوون. بەشێك لە ژمارەکانی ئەم گۆڤارە، لە کتێبخانەی I.N.A.L.C.O کە بە لانگزۆ ناودارە لە شاری پاریس، بەم کلیلە دەدۆزرێتەوە: (Per .١٨) هەروەها (Per ٥٤٢٣) بەشێکی تریشی ئەم گۆڤارەم لە کتێبخانەی نیشتمانی پاریس BNP و قوتابخانەی لێکۆڵینەوە ئاسیایی و ئەفریقییەکان Soas لە لەندەن دۆزینەوە، بەشێکی تریشی لە ژووری بازرگانی شاری مارسیل ccm لە فەرەنسا. بەشەکەی تریش لە کتێبخانەی میللی ئەنقەرە Ankara Mili Kutuphanesi دا.

## چەند سەرنجێکی گشتی لە بارەی ئەم گۆڤارە و خاوەن ئیمتیازەکەی:

١-لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئەم گۆڤارەدا (١٩٠٩-١٩١٤)، سیاسەتمەدارو ڕووناکبیرانی کورد لە زۆربەی مەڵبەندە ستراتیژیەکاندا بە تایبەتیش لە پاریس و ئەستەمبوڵ و قاهیرەو لەندەن و ژنێف، کەوتبوونە خۆیان بۆ ئەوەی بتوانن شتێك بە شتێك بکەن بۆ سەربەخۆیی کورد.

٢-لە سەردەمی ناوبراودا، ڕەوت و ئایدیۆلۆژییەتی جۆراوجۆر هەبوو لە بواری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورددا، لەوانە: ڕەوتی پان- ئیسلامی، ڕەوتی پان عوسمانی، ڕەوتی گەنجە تورکەکان، ڕەوتی ڕادیکاڵی و لیبراڵی (کە ئەم گۆڤارە و خاوەن ئیمتیازەکەی، شەریف پاشا، لەو ساڵانەدا نوێنەری بوون). ڕەوتی "سەربەخۆگەری کوردستان" کز بوو.

٣-شەریف پاشا، خاوەن ئیمتیازی ئەم گۆڤارە، جارێ هێشتا باوەڕە سیاسییەکەی پێش نەکەوتبوو: نەگەیشتبووە باوەڕهێنان بە پێویست بوونی دامەزراندنی دەوڵەت بۆ کوردستانو سەربەخۆیی کورد.

٤-شەریف پاشا، لە هەمان کاتدا، لەو ساڵانەی (١٩٠٩-١٩١٤)دا، پێوەندییەکی توندو تۆڵی لەگەڵ (جەمعیەت) و (کلووب) و (ڕۆژنامە)و ڕێکخراوە کوردییەکانی ئەستەمبوڵ و قاهیرەو ژنێف هەبوو. پێوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ کەڵە ڕووناکبیرە کوردەکاندا هەبووە. بارەگای حزب و نووسینگەی گۆڤارەکەیشی، لە پاریس، بەرامبەر بارەگای جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی بوو (١١٥ Rue de la Pompe, Paris 16).

٥-ئایا هۆی چییە کە ئەم گۆڤارە سیاسییەی ئەم کەڵە ڕووناکبیرەی کورد بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە؟ بۆچی بە زمانی کوردی یان بە زمانێکی ڕۆژهەڵاتی نەبووە؟

ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی، کریس کووچێرا، لە کتێبەکەی خۆیدا دەڵێ: شەریف پاشا، کە ئەو ماوەیە لە فەرەنسا دەژیا، هەوڵی دەدا لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی فەرەنساو لەگەڵ پیاوماقووڵانی فەرەنسی وتووێژ بکات بۆ ئەوەی کێشەی کورد لەو ڕێگەیەوە چارەسەر بکرێ، فەرەنسا دەیگوت کە شەریف پاشا دەیەوێ ببێتە "ئەمیری کوردستان" و مافی نەتەوەیی ناوخۆ لەژێر ئینتیدابی فەرەنسادا بۆ کورد وەدەست بهێنێ[(١٥)].

کەواتە، هۆیەکانی نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەم گۆڤارە بە زمانی فەرەنسی، دەکرێ بەم شێوەیە لێك بدرێتەوە:

أ-ئامانجی سەرەکیی گۆڤارەکە ئەوە بوو کە ڕای گشتی نێودەوڵەتی لە بارەی "مەسەلەی کورد" و "دەوڵەتی عوسمانی" ببزوێنێ، بە تایبەتیش ڕای گشتی لە فەرەنسا.

ب-خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە یارمەتی لە حکوومەتی فەرەنسا- خۆی وەرگرتووە. فەرەنسا پشتیوانێکی گەورەی ئەم ڕەوتەی شەریف پاشا بووە.

ج-زۆربەی حزب و رێکخراو و سیاسەتمەدارو رووناکبیرە تورك و کوردو عوسمانییەکانی دیکەی ئەو سەردەمە، یان لە فەرەنسا دەژیان یان زمانی فەرەنسییان زانیوە.

٦-ژمارەی دووەمی گۆڤارەکە، سەرتاپای، بە زمانی ئینگلیزییە ،دیارە ئەمەش هەر بەڵگەی ئەوەیە کە گۆڤارەکە ویستوویەتی کاریکاتە سەر رای گشتی لە بەریتانیاو حکومەتی ئینگلیز بۆ لای خۆی "بۆ مەسەلەی کورد" رابکێشێ ٠بە تایبەتیش لەبەرئەوەی "ئینگلیزەکان شەریف پاشایان خۆش نەویستووە"، "مەسەلەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بە پێی سیاسەتی ئینگلیز هێندە گرنگ نەبوو"، "ئینگلیزەکان دەیانوت کە شەریف پاشا پیاوێکی لایەنگری فەرەنسایە"[١٦].

کەواتە، شەریف پاشا بۆیە هەندێ لە لاپەرەکانی گۆڤارەکەی، تەنانەت ژمارەی دووەمی، هەر هەمووی، تەرخان کردووە کە بە زمانی ئینگلیزی بلاوببێتەوە. ئەوەتا لە لاپەرە (٣-٤)، لە ژمارە (٢)دا دەڵێ:

**Greeks, Armeniens, Kurds and Albaneses, without Counting the liberal Turks, Suffer all the More frome this Stat of things, because they are unable to give voice to their complaints.**

٧-بە پێی هەندێ لە وتارەکانی شەریف پاشا کە لەم گۆڤارەدا بلاوکراونەتەوە، بۆ نموونە بە پێی ژمارە (٢٣)ی مانگی ئۆکتۆبەری (١٩١١)، شەریف پاشا زمانی یۆنانیو ئیتالیو ئەلمانیشی، جگە لە فەرەنسی و ئینگلیزی زانیوە.

## ناواخنی گۆڤارەکە:

مەشرووتیەت Mechroutiette، گۆڤارێکی سیاسی بووە. ئەگەر وردبینانەتریش دەستنیشانی بکەین ،پێویستە بوترێ کە ئۆرگانی حزبێکی رادیکالی عوسمانی Parti Radical Ottoman بووە. کەواتە ناواخنی گۆڤارەکە، بە شێوەیەکی گشتی بریتی بووە لە پرۆگرامێکی دیاریکراو: "بەرگریکردن لە بەرژەوەندییە سیاسیو ئابووریو مافە رەواکانی خەڵکی نێو چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە نەژادو دینییان".

١-گۆڤارەکە، سەبارەت بەوەی کە ئۆرگانی حزبێکی رادیکالی لیبرالیی، لە دیدی "سەربەخۆیی" و "دەوڵەتخوازی کوردییەوە" نەیڕوانیوەتەوە کێشەی کورد.

وتاری (لە کوردستاندا DansieKurdistan) یەکەمین وتاری سەربەخۆیە کە تەرخانکراوە بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی کورد. ئەم وتارە لە لاپەڕە (٣)ی ژمارە (٨)ی گۆڤارەکەدا بلاوکراوەتەوە. دیدێکی رادیکالیو لیبرالی پێشکەش دەکات بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی دەستووری عوسمانی رادیکالدا، کە ئەوکاتە خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە، شەریف پاشا باوەڕی پێ هەبووە.

٢-گۆڤارەکە، بەردەوام، لە هەموو ژمارەکانیدا رەخنەی زۆر توندو تیژ لە فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی تورکیای "گەنجە تورکەکان" دەکرێ لە سالانی حزبە پان ئیسلامی و پان عوسمانییەکانیش دەخاتە ژێر رەخنەو تاوانکارییەوە. تەئکیدێکی زۆر لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە رێکخراوی(ئیتیحادو تەرەقی) لە (١٩٠٨) بەملاوە، واتە دووای ئەوەی جڵەوی فەرمانڕەوایەتیان گرتە دەست، کەوتنە چڵپاوی "خیانەتکاری" و زۆرداریییەوە.

٣-دەنگوباسی بارودۆخی کۆمەلایەتی و ئەخلاقی و ئابووری نەتەوە ژێردەستەکانی دەوڵەتی تورکیا، هەوالی سیاسی و ژیانی رۆشنبیری و رۆژنامەیی لە تورکیا، بە تایبەتیش

ژیانی ژێردەستەیی ئەرمەن و عەرەب و کوردو ئەلبانیو قوبرسی.. وێڕای وتاری ڕەخنەگرانەی سیاسی و لێکۆڵینەوەی سیاسی لە بارەی ڕووداوە گرنگەکان و چارەنووسی نادیاری تورکیا، گرنگترین بابەتە بلاوکراوەکانی ئەم گۆڤارەن.

خاوەن ئیمتیازی گۆڤارەکە، سەبارەت بەوەی کە کورد بووە، لەم بارەیەوە بایەخێکی فرەوانترو قووڵتری داوەتە کوردستان و کێشەی سیاسی کوردەکان.

٤-لە ژمارە (١١)ی گۆڤارەکە بەملاوە، هەموو جارێك، لە هەموو ژمارەیەکدا، پەیڕەو پڕۆگرامی (حزبی رادیکالی عوسمانی) لەسەر بەرگی پشتەوەی گۆڤارەکەدا لە (٤٤) بڕگەدا بلاوکراوەتەوە.

سەیر لەوەدایە لە هیچ بڕگەیەکی ئەو پەیڕەو و پڕۆگرامەدا ناوی کورد نەهاتووە، تەنیا لە بڕگەی دووەمدا دەڵێ:

"هەموو عوسمانیەك، لە هەر نەژادو دینێك بن ،بە ئازادی دەژین و نیشتەجێ دەبن. هەر هەمووشیان لە ماف و ئەرکەکانیاندا، بێ جیاوازی، یەکسان دەبن".

٥-بەشێکی گۆڤارەکە تەرخان کراوە بۆ بلاوکردنەوەی بیرو بۆچوونی سیاسەتمەدارو ڕووناکبیرە ئەوروپاییەکان لە بارەی ئێستاو داهاتووی سیاسی تورکیا، بە تایبەتیش ئەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارە ئەوروپاییەکاندا بلاوکراونەتەوە.

٦-ئەو وتارانەی کە تەرخانکراون باس لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و بارودۆخی ئەوسای کوردستان دەکەن، گرنگترینیان ئەمانەن:

-ژمارە (١٤)، لاپەڕەی هەواڵەکان.
-ژمارە (١٥)، ل ١، ٤٣-٤٧.
-ژمارە (١٦)، ل ٧-١٧ و ٢٣-٣٢.
-ژمارە (١٧)، ل ٦١.
-ژمارە (١٨)، ل ١-٨.

-ژمارە (١٩)، ل ٢٤-٢٦.
-ژمارە (٢٠)، ل ٧-١٣.
-ژمارە (٢١)، ل ٣٤- ٣٧.
-ژمارە (٢٤)، ل ٤٨
-ژمارە (٢٥)، ل ٢٣-٣٢
-ژمارە (٢٧)، ل ٣٧.
-ژمارە (٢٨)، ل ٣٥-٣٩.
-ژمارە (٢٩)، ل ٣٥-٣٧.
-ژمارە (٣٣)، ل١١-١٥
-ژمارە (٣٦)، ل ٧-٢٢.
-ژمارە (٤٠) بەملاوە، لەهەر ژمارەیەکدا وتارێك تەرخان کراوە بە کێشەی کوردستانو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد.

## هەڵبژاردەیەك لەم گۆڤارەوە: وتەکانی شەریف پاشا

چەند کۆپلەیەك لە نووسینەکانی ئەم گۆڤارە هەڵدەبژێرین، کە بە قەڵەمی شەریف پاشا- خۆی نووسراون: بۆ ئەوەی لامان ڕوون ببێتەوە ئاخۆ شەریف پاشای "سەرۆك حزبی رادیکاڵی عوسمانی"، لە ساڵی (١٩١٣)دا (پێش ئەوەی بیری سیاسیی پێش بکەوێت و ببێتە ناسیوونالیست) چۆن لە "مەسەلەی کورد" تێگەیشتووەو باوەڕی چۆن بووە لە هەمبەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لەو سەردەمەدا؟

**پیرۆزنامەیەك بۆ بلاوبوونەوەی ئۆرگانی "ڕۆژی کورد" لە ١٩١٣**

**بلاوبوونەوەی ئۆرگانێکی کوردی (ڕۆژی کورد) لەم دووایییەدا لە ئەستەمبۆڵ، بووە مایەی خۆشحاڵییەکی یەکجار زۆر بۆ دەستەی کارگێڕانی گۆڤاری مەشرووتیەت Mechroutiette. ئێمە، لای خۆمانەوە، هەرگیز درێخیمان لەوە نەکردووە کە سیاسەتێکی دادپەروەرانە لە هەمبەر هاولاتیە موسڵمانە غەیرە تورکەکان پەیڕەو بکەین و بلاوبکەیتەوە.**

**لەژێر سایەی حکوومەتەکەی پێشوودا، کورد وەك عەرەب، ببوونە قوربانی ئەو بەر پرسیارو فەرمانبەرانەی کە حکوومەتی مەرکەزی دەیناردنە مەلبەندەکانیان ئەو بەرپرسیار و فەرمانبەرانە، هیچ شتیکیان لە بارەی خەلك و ولاتی کوردەوە نەدەزانی، کەچی دەشبووایە بەریوەیان ببەن! ئیدی، بەم شیوەیە، ئەم میللەت و ولاتەیان، بە پیی هەواو کەیفی خۆیان، خستبووە چەرمەسەرییەوە هاوولاتیە مەسیحیەکانمان، هیچ نەبووایە دەیانتوانی پەنا بۆ پاتریرکەکانی خۆیان ببەن بۆ ئەوەی گازاندەکانیان بگەیەننە حکوومەتی مەرکەزی و داوایان لی بکری کە هیچ نەبێ بۆ ماوەیەك ئەو زولم و زۆرەی سەر مەسیحیەکان رابگیرێ. بەلام کوردەکان، بە هیچ شیوەیەك کەسیان نەبووە. نەیانتوانیوە گەزاندەو هانای خۆیان بگەیەنن بە هیچ دەسەلاتداریك.**

**ئەمە راستە، کە هەندێ سەرکردەی کورد، لە ریگەی دەسەلاتداریتی ناوخۆی ناوچەکانەوە پاریزراون، بەلام زیاتر لە چوار ملیۆن کوردن لە مەرگەساتی و چەرمەسەریدا ژیاون و لە لایەن ئاغاو سەرکردە و حکوومەتەوە چەوسینراونەتەوە.**

**هاتنە سەر حوکمی "حکوومەتی دەستووری" وای کرد کە هیوایەك لای کوردەکان پەیدا ببێت. بەپێی قانوون داخوازی ئەوەیان کرد کە دان بە نەتەوەکەیاندا بنرێت، وەك توخمێکی پێکهێنەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی!**

**کورد لەم هەوڵەیدا تووشی هەناسە ساردی هات. جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی، کە ئەمڕۆ جڵەوی حوکمیان گرتۆتە دەست، وەك سوڵتان عەبدولحەمید، بوونی کوردی پێشێل کردووە. جەمعیەتی ناوبراو هەوڵی ئەوە دەدا کە هەموو نەتەوە موسڵمانەکان بە ناوی دین و لەژێر ئاڵای ئیسلامدا کۆبکاتەوە، ئەم پان تۆرانیزمەی ئیتیحادو تەرەقی نایخوات، زۆر دەمێکە هەرەسی هێناوە.**

**لەم سەدەی بیستەمەدا، سەرکردەکانی جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی "کە هەمووشیان خوێندنیان لە پایتەختە درەوشاوەکاندا تەواو کردووە" کەچی تازە بە تازە هاتوون پرنسیپی "دین" لە جیاتی پرنسیپی "نەتەوە پەروەری" بەکاردەهێنن. ئێمە، هەموومان، دەزانین: میللەتی وا هەیە تەنانەت دینی خۆشیان گۆڕیوە، بەڵام دەسبەرداری نەژاد و نەتەوەکەی خۆیان نەبوونە جەمعیەتی ناوبراو، دیارە ئێستا دەستیان لەو پڕۆژەیە هەڵگرتووە کە نەژادە غەیرە تورکەکان بکەنە تورك.**

**لەم ئۆرگانە کوردییە تازەیەی (ڕۆژی کورد)دا، لوتفی فیکری بەگ ،کۆنە ئەندامی مەجلیسی عالیی شاری دەرسیم، حکوومەتە تازەکەی تورکیا دەخاتە بەردەم، ڕەخنەو لێپرسینەوەیەکی توندەوە، ئەمەش سەبارەت بەوەی کە حکوومەتی ناوبراو نەتەوەی کوردی فەرامۆش کردووە.**

**"ئەگەر بێداربوونەوەی کورد کەمێك درەنگی پێ چووبێ"، لوتفی بەگ دەڵێ "هۆیەکەی ئەوە بوو کە کورد ڕێی بۆ خۆش نەکراوە کە بتوانی تێکەڵ بە میللەتانی**

**شارستان ببێت، بەڵام "ئەمڕۆ کـە کـورد بێـدار بۆتـەوە، ئەمـە ئـەرکی ئێمەیـە کـە نەهێڵین چیتر لە خەوی غەفڵەت و دوواکەوتندا بمێنێتەوە".**

**لە کۆتاییدا، زۆر بـە گـەرمی پیرۆزبـایی لـە هاووڵاتیـە کوردەکـان دەکـەین و ئاواتەخوازین کە بتوانن لەگەڵ ئەرمەنییەکان دەست لـە دەسـتی یـەکتر بنێـن بـۆ ئەوەی بتوانین، بەکردەوەیـەکی هاوبـەش و هاوخەباتـە، لـە دەسـت ئـەو بەڵایـەی وڵاتەکەمان ڕزگارمان بێت کە ناوی جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی‌یە.**

**mechroutiette, n, 47, p. 40-43, Paris: 1913.**

*کورد، هەموو خەڵك دەزانێ، زیرەکییەکی وردیـان هەیـە، هـەروەها بـەهرەی ئەوەشیان هەیە کە بتوانن لەناو میللەتانی دیکەدا بتوێنـەوە، ئەگـەر تـا ئـەمڕۆ، بـە شـێوەیەکی گشـتی فـەرامۆش کرابـن لـە لایـەن حکوومـەتی عوسمانییـەوە، ئـەوا بەرپرسیارێتی ئەم فەرامۆشکراوییە دەکەوێتە ئەستۆی ئیدارەی تورکەکان. ئیـدارەی تورك لە جیاتی ئەوەی بە شێوەیەکی چاك سـوودیان لێ ببینـێو بـەکاریان بێنـێ، ژیانی هەموویانی خستۆتە هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەوارییەوە..**

مەشرووتیەت، ژمارە (٤٠)، (٨-٩، مارس ١٩١٣).

****ئەوەی کوردەکان بە شێوەیەکی ئازاد پیشان دەدات و دەیسەلمێنێ کە کورد ئازادیخوازن، ئەوەیە کە ئافرەتەکانیان هەرگیز پەچە ناپۆشن.**

مەشرووتیەت، ژمارە (٤٠)، ل٩ ، مارس ١٩١٣).

*****کورد، دووای عەرەب، لە ڕووی سەرژمێرییەوە، بە دووەم نەتەوە دەژمێردرێت لە تورکیا، چونکە ئەمڕۆ ژمارەیان دەگاتە پێنج ملیۆن کـەس لـە تورکیـا. ئەمـە لـە کاتێکدا تورکی ڕەسەن تەنانەت (٢) ملیۆنیش نابن.**

مەشرووتیەت، هـ .س.

*کوردەکانی وڵاتی ئێران Perse کــە ژمارەیـان زیاتریشـە، لـە ئاست کێشـەی کوردەکـانی تورکیـا بێدەنـگ نامێننـەوە. کوردەکـانی ئـەوێ بەشـێکی گــەورەی پیشەسازی ئەوێیان بە دەستەوەیە. فەرشی فارســی هـەرە نایـاب، کـە بـە فەرشـی سنەیی ناودارە، بە دەست و پەنجەی ژن و کچە کوردەکان دروست دەکرێن*

بە یەك وشە، کوردەکان گروپێکی ئەتنیکی زۆر ڕەســەن پێکدەهێنـن، هەمیشـە ئامادەن بە چەکی خۆیان بەرگری لە بوونی نەتەوەیی خۆیان بکەن، نەك هــەر دژ بە ئەرمەنییە جودا خوازەکــان، بـەڵکو دژ بـە هـەر داگیرکـەرێکی بێگانـەو دژ بـە بنەماڵـەی داگیرکـەری تورکیـش. بۆیـە، کـورد وەك نەتەوەیـەك لـە چوارچێــوەی تورکیادا، پێویستە حسیبی خۆی بۆ بکریت.

mechroutiette, n.,40, P.g, mars 1913.

*کورد هەمیشە بە شیوەیەکی ئاقلانە ژیاوە لەگەڵ ئەرمەنیـەیکاندا. حکوومـەتی حەمیدیەو حکوومەتی ئیتیحادیەکان بوو کە کوردی لەو ساڵانەی دووایيــدا گلانـدە نیو ئەو چلکاوە پیسەی قەتلوعامی ئەرمەنییەکانەوە.

ئیمەی کورد، ئەمرۆ، بە قەد دلسۆزەکانی ئەرمینیاو زیــاتریش، شـیوەن بـۆ ئـەو قەتلوعامە دەگیرین. لە تۆلەی ئەم قەتلوعامە و دەنگدانەوەی لــە جیـهاندا، ئـەمرۆ ئەرمەنییەکان دەیانەوێ دەولەتیکی ســەربەخۆیان هـەبیت و کـورد -وەك کۆیلـە- بخەنە ژیردەســتی خۆیانـەوە. کوردیـش، بـە شـیوەیەکی سروشـتی، ناتوانـێ ئـەم گریمانەیە قبوول بکــات و بکەویتـە بـن دەسـتی زولـم و ریاکـاری حکوومـەتیکی بیگانەی دیکەوە.

ئەم دوو نەژادە پاکە، پیویستە لە چوارچیوەیەکی قانوونیدا پیکەوە هەلبکەن، لـە پیناو پیکەوە ژیانیکی ئاسوودەو ئارام لە دەولەتی عوسمــانیدا، وەك جـارانی پیـش

**قەتلوعامەکە. چونکە کورد و ئەرمەن، هەر چەندە نەژادیان لیکتر جیاوازە، بەلام هەمان رۆحیات و ئاکاریان هەیە. بەرژەوەندییان لەوەدایە کە هەر دوولا، بە شیوەیەکی هاوریبانە لەگەڵ یەکتر بژین.**

**هەر دوولایان، لە کانگای دلەوە حەز لەوە دەکەن کە چەند ریفۆرمیك، لەسەر بنچینەیەکی یەکسانی و دادپەروەرانە بیتە ئارا. ئەم حەزە هاوبەشەش، وا پیدەچێ پیویست بێ کە لە خەباتیکی هاوبەشدا کۆبکریتەوە. لەم بارەیەشەوە، پیویستە هەردوولامان مەنهەجی methodiqur بین.**

**mechroutiette, n, 40, p,g, mars 1913.**

## بایەخی ئەم گۆڤارە

١-ئەم گۆڤارە ویستگەیەکی فیکری گرنگی شەریف پاشایە، یەکیك لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی بیری سیاسی ئەم سیاسەتمەدارە کوردەمان بۆ روون دەکاتەوە: پیش ئەوەی باوەر بە "کوردایەتی" بهینیت و داوای دەولەتی سەربەخۆی کوردستان بکات.

٢-ئەم گۆڤارە سەبارەت بەوەی رادیکال لیبرال بووە، ئاوینەیەکی بیگەردی خەوش و هەلە و ناتەواوییەکانی حزبەکانی دیکە بووە. هەقیقەتی هەموویان پیشچاو خستووە و رادیکالانە لیی کۆلیونەتەوە.

٣-ئەم گۆڤارە، بەشیك لە واقیعی ژیانی کوردستانی و گەلی کوردی لە سالانی (١٩٠٩-١٩١٤)دا پیشان داوە، چەند لاپەرەیەکی لە میژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردی لەسەر لاپەرەکانی خۆیدا تۆمار کردووە و پاراستوویەتی.

٤-ئەم گۆڤارە بە گەویکی گرنگی جموجولی رۆژنامەگەری کوردی- بە زمانی فەرەنسی لە قەلەم دەدریت.

## سەرچاوە و پەراویز:


1-Rouillard clarence DANA: The Turk in the French hidtory, paris: 1938, P.80

2-Bernard LEWIS: the Emergence of Modrne Turkey, ford: 1961. p.55.

3-J.BISLUPSKI: La culture et

l'influence Francaise en Turquie
(1453- 1935) Sorbonne. paris.

4-I. LAGARDE: Notes sur les journau Francais de Constantinople a L'epoqe

revolutionnaire in (Jounal
Asiatique) Paris: 1948 , p.271-276.

5-Francois Georgeon : Apercu sur Ia presse de Ia Iangue francaise en Turquie

pendant Ia periode kemaliste, in
"Collection turciacal , paris :1981

٦-پیشتر، لە ١/١/١٨٦٥دا مافی رۆژنامەگەریتی لە دەولەتی عوسمانیدا، بە تەئسیری قانوونی ١٧/٢/١٨٥٢ی ولاتی فەرەنسا لە بارەی مافی ئازادیی دەربرینی بیروڕای رۆژنامەنووسی بلاوکرابۆوە.

7-paul Fasch: Constantinople auv dernieres jours d'Abdul Hamid , paresse:1907

, p.52

8-G,groc , I caglar: La presse francaise de Turquie , Ed.lsis; Istanbul
1985, P.19-28.

9-G.Groc - I. caglar: Ia presse fran- caise de turqnie de 1795 a nos jours, ed. isis.,

15 tanbul: S.D., P. 194.

١٠-فەرهاد پیربال: زنجیرەی ژیاندنەوەی نووسراوە عوسمانییەکان، شەریف پاشاو کۆنفرانسی ئاشتی، گ یەکگرتن، ژمارە ١٣، کۆپنهاگن:١٩٩١،ل ١٠٠-١٠٤

11-mechroutiette, Constitutionnel -~ Ottoman, organ du parti ottoman (I entente Iiberale) sous Ia patronage de G. cheri f - pacha, N.47, Oct. 1913.

12-chris kutschera: Ie mouvement -~ national kurde, ed. flammarion, paris:1979, p.25-45.

١٣-هەمان سەرچاوەی سێیەم.

14-cheri f pacha:memorandum sur -Ies revandications dn peuple kurde, Impr. a — g— I, hoir, paris: 1919, 15 pages.

15-chris kutschera: Ie mouvement national, p. 25 - 45.

16-chris kutschera: le mouvement national, p. 25 - 45.

# ئەلبووم

وینەکانی خودی شەریف پاشاو باوکی شەریف پاشا ٠(سەعید پاشای خەندان)، هەروەها وینەی برایەکانی و ژن و منداڵەکانی، هەروەها ئەوانی تریش کە لیرەدا پیشاندراون ، لە ماوەی ساڵانی (١٨٨٧-١٩٢٠) لە ئەستەمبول و بەغدا و قاهیرە یان لە ژنیف و پاریس و لەندەن بە کامیرای کوردناسەکانی ئەوروپا یان لە ستۆدیۆکانی ئەستەمبول و ئەوروپا گیراون.

هونەری فۆتۆگرافی لە سالی (١٩٠٠) بەملاوە، لە ریگای بەغداو بە تایبەتیش لە ریگای ئەستەمبولەوە، واتە لە ریگەی ئەو وینەگرە ئەرمەنیو جوولەکە و رۆژئاواییانەوە کە لە ئەستەمبول و بەغدا دەیان، گەیشتە ناو ئەو سیاسەتمەدارو رووناکبیرە کوردانەی لە ئەستەمبول و بەغداو شارە گەورەکانی دەولەتی عوسمانیدا دەژیان.



ئەمینە خانم، کچی مامی مەلیك فاروق خێزانی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا



( شەریف پاشاو ساڵح بەگو مەلەك خانمی كچی شەریف پاشا
لەنێوانیاندا ڕاوەستاوە. )



(شەریف پاشاو كچەزاكەی)



بارەگای حزبی ئیتیحادو تەرەقی لە ئەستەمبۆڵ ١٩١٨



شەریف پاشا لەگەڵ سەفیری میسر لە ڕۆما، لەگەڵ کچەکەی و
زاواکەی لە ساڵی ١٩٤٦



کچە گەورەکەی شەریف پاشا ( شەریفە خانم )



**شەریف پاشا لە نایت کلەبیکدا کاریکاتیری هونەرمەندی سویدی**
Albert Engstrom



**شاری سلیمانی، هەوارە کۆنەکەی شەریف پاشا کە لە سالی ١٨١٧**
**لە لە ندەن وینەی کیشراوە لە لایەن ولیەم هیود** W.Heude
**لە کتیبی** Avoyage up the persien



**د. عەبدوڵا جەودەت دامەزرینەری ئیتیحاد و تەرەقی**
**هاوریی ژەنەراڵ شەریف پاشا**



**سەرۆك وەفدی ئەرمەنیەكان**
**نووبار پاشا ١٩١٩**



**سەرۆك وەفدی كوردان،**
**شەریف پاشا ١٩١٩**



**ژەنەراڵ شەریف پاشاو**
**ئیمزاکەی لە سالی ١٩٠٨**



ئۆسکاری دووەم، پاشای سوید میدالیا لە یەخەی ژەنەراڵ دەدات



**ژەنەراڵ شەریف پاشا**
**بە کامیرای سەلما جاکۆبسن لە ساڵی ١٨٩٩**

# یاداشتنامە

## لە بارەی داخوازییەکانی گەلی کورد

**Memorandum sur Les Revendications du Peuple Kurde ,**

**imprimerie A. - G. L, Hoir; 26, Rue du Delta, 26**
**Paris: 1919. (15 pages).**

دووا بە دووای بەزینی ئەڵمانیاو ئیمپراتۆری عوسمانی لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا، لە ساڵی ١٩١٩ کۆنفرانسێکی جیهانی بەنێوی کۆنفرانسی ئاشتی بۆ نەتەوە بندەستەکانی رۆژهەلات و ولاتەکانی ئەو دەروبەرە، لە پاریس بەسترا، کە مەسەلەی چارەنووسی گەلانی بندەستی ئیمپراتۆری عوسمانی (کورد، عەرەب، ئەرمەن..) گرنگترین بابەتەکانی کۆنفرانسەکە بوون. وەفدی گەلی کورد لەو کۆنفرانسەدا بە سەرۆکایەتی ژەنەراڵ شەریف پاشا بوو، کە بە زمانی فەرەنسی ئەم یاداشتنامە بەنرخە مێژووییەی لە بارەی داخوازییەکانی گەلی کورد پێشکەش کرد، کە بەرزترین ئاستی هۆشیاریی سیاسیو نیشتمانیی ئەو سەردەمە دەردەخات. لەوانەیە هەر ئەم یاداشتنامەیەش رۆڵی هەبووبێت لە ئیمزاکردنی پەیمانی سیڤەر لە ساڵی ١٩٢٠دا.

شایانی باسە، ئەم یاداشتنامەیە، یەکەمین یاداشتنامەی کوردایەتیی نێودەوڵەتییە کە چین و توێژو رێکخراوە کوردییەکان، زۆربەیان، لە هەموو پارچەکانی کوردستانەوە، سەرتاسەر، پشتگیرییان کردبێت و لەسەری رێك کەوتبن. پێش ئەمە، هیچ یاداشتنامەیەکی کوردایەتی، لە سنووری عەشیرەتێك یان میرنشینێك یان پارچەیەکی کوردستان تێپەڕی نەکردووە.

# یاداشتنامە
# لە بارەی داخوازییەکانی گەلی کورد[1]

داخوازییەکانی ئەرمەنییەکان، سەرەرای ناواخنی ئیمپریالیستانە، مادام ئەمرۆ بە شیوەیەکی رەسمی دانیان پیدانراوە، کەواتە منیش وا تیدەگەم لە توانامدا هەبێ، بە تایبەتیش لیرە لە بەردەم کۆنفرانسی ئاشتیدا، کە داخوازییە رەواکانی نەتەوەی کورد رابگەیەنم[2].

کەوشەنەکانی کوردستانی تورکیا، لە رووی ئەتنۆگرافییەوە، بەم شیوەیە دەست پیدەکەن: لە باکووردا شاری Ziven ویرا ویرای سەر سنووری ولاتی قەوقاز،کەدریژ دەبیتەوە بەرەو رۆژئاوا تادەگاتە ئەرزە رۆم، ئەرزنجان، Kemah، ئەرەبگیر، Divick, Behismi؛ لە باشووردا Haran، تەپۆلکەکانی ژەنگار، تەلەعفەر، ئەربیل، کەرکوك، سلیمانی، man AKK- el، سنە؛ لە رۆژهەلاتیشدا بە رەواندز دەست پیدەکا، باشقەلا، وزیرقەلا، واتە ویرای سنووری ولاتی فارس، تا دەگاتە چیای ئارارات.

کوردەکان، لە رۆژگارە هەرە دیرینەکانەوە، بەناوی جیاجیا؛ لە سیزدە سەدە لەمەوبەریشەوە بەناوی کورد لەم مەلبەندانەدا گیرساونەتەوە و بنەگربوونە[3].

تا ئەو رۆژەی بە خواستی خۆیان چوونەتە ژیر رکیفی دەسەلاتداریتیی سولتان سەلیمی یەکەمەوە، ولاتەکەیان (کوردستان) لە چل و دوو میرنشینی سەربەخۆ پیکهاتبوو: دیاربەکر، دیناوەر، Ardial, Ler Charry Soul، هەکاری، ئامیدی، Fink, Kurkel، حەسەن کیف، Guezek, Tchemuche ـ میرداسی، Kilis, Hezan, Sassour, ، شیروان، Daoud, Kalai, ، سلیمانی، سەحران، Ter- Hak, Erdikan, Derzini, Derzini, qual

Terkour، پلّینگان، بەتلیس، گارزان، بۆتان.. هتد. هــەموو ئـەم شـارانە لـەژێر دەسـەڵاتی میرنشینە کوردە سەربەخۆکاندا بوونە.

مۆمسن Mommsen، لە کتێبەکـەی خۆیـدا لـە بـارەی مێـژووی ڕۆمانییـەکان، وڵاتـی ئەرمینیای خستۆتە نێوان سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلە- فورات و ڕووباری کوور Kur.

ئینسیکلۆپیدیای ئینگلیزی Nuttals مەسەلەکەمان لەوە باشتریش بۆ ڕوون دەکاتـەوە، وا لێرەدا دەقاودەق قسەکانی دەگوازینەوە:

((ئەرمینیا وڵاتێکە لە ڕۆژئاوای ئاسـیادا، کەوتۆتـە ڕۆژئـاوای دەریـای قەزوێنـەوە، لـە بـاکووری چیاکـانی کوردسـتاندا، دابەشـکراوەتە سـەر تورکیـاو ڕووســیاو وڵاتــی فــارس؛ دەشتێکی شەقار شەقار پێکدەهێنێ؛ ئەملاو ئەولای چەند دۆڵێکی بـە پیـت و پـاراون کـە لووتکەکانیان لە چیای ئاراراتدا قووت دەبنەوە".

ئەم ڕاستییە، بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەرمەنییەکان لە حاڵەتی دەسەڵاتراخســتنی خۆیاندا، پێویستە ڕوو لە وڵاتەکەی خۆیان بکەن، نەوەك بێن بە شێوەیەکی ناڕەوا مـرخ لـە مەرزو بوومی کوردان خۆش بکەن(٤).

لەمەڕ ئەو بەشی کوردستانەی کە دەکەوێتە ویلایەتی ئەرزەڕۆمەوە، ئێمە دەتوانین پشت بە بەڵگەی جوگرافیاناســی مـەزن (ئێلـیزێ ریکلـووس) Elisec Reclus ببەسـتین، کـە لـە کتێبە گەورەکەی خۆیدا، سنورە گشتییەکانی هەندێ لە هەرێمەکانی ئاسیای دیاریکردووە؛ کە ئـەم سـنوورانەش، بـە بۆچوونـی ئـەو، کوردسـتانێکی ڕەوایـان Legitime لێ پێکدێـت، ئەمــەش سـەبارەت بـە زۆریـی ژمـارەی کــورد لــەو هەرێمــەداو هــەروەها ســەبارەت بــە سنورەکانیان(٥).

ئێمە، بە ئەرکی خۆمان، ناتوانین خۆمــان لـە بەڵگـەکانی ئـەم جوگرافیاناسـە گەورەیـە بدزینەوە، ئەمەش لە پێناو بنیاتنانی بناخەکانی پەیامی مرۆڤایەتی، لە پێناو پیادەکردنی

پرنسیپی نەتەوەکان - Principe des Nationalites لـە بـواری ئـەو گۆڕانـەی داهـاتوو کـە بەسەر نەخشەی جیهاندا دێت(٦).

"لەنێو ئەو دەشت و دۆڵانەی، بە تایبەت دەوروبەری زابی گەورەدا، کۆمەڵە خەڵکێك لە شێوەی چەند خێـڵ و عەشـیرەتێکی یـەکانگیردا، نەتەوەیـەکی خـاوەن هـێزی هێنـدە گـەورە پێکدەهێنن، کە بە ڕاستی بتوانن لە هەمبـەر تـورك و فارسـەکاندا کەڵکەڵـەی سـازکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت".

فەرموون ئەوەتا، یەکێك لە گەورەترین جوگرافیاناسـەکان، لـە سـاڵی ١٨٨٤دا ئەمـەی سەرەوەی نووسیوە. بە شێوەیەکی سروشتی، چەند خەسڵەتێکی دانسـقەی دیکـەش هـەن کـە بتوانن لەم کۆنفرانسەدا وەدیار بکەون.

هیواداریـن ڕێگامـان بدرێتـێ پەنجـەنومای ئـەوەش بکـەین کـە لـە حاڵـەتێکی ئەگـەر مەڵبەندە کوردنشینەکانیش هەر بخرێتـە پـاڵ ئـەو دەوڵەتـە ئەرمەنییـەی خەریکـە دروسـت دەبـێ؛ سـەبارەت بـەوەی کـە کـورد خـەڵکێکی جـەنگاوەرن و هەمیشـە حـەز لـە ئـازادی و سەربەخۆیی نەتەوەکەیان دەکەن؛ ئـەوا ئـەو دەوڵەتـە ئەرمـەنییـەی داهـاتوو، قەتاوقـەت، لـە پشێویو قەیرانێکی بەردەوام زیـاتر، هیچـی تـر بـە چـاوی خۆیـەوە نابینـێ؛ تـەنیا مـەگـەر دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بە خۆیان و بــە لەشـکرێکی گـەورەوە بێـن هێزەکـانی خۆیـان لـەوێ ڕابخەن، کە لەو کاتەشدا، ئەوانیش هەر دەکەونە بەر شاڵاوی جەنگیکی بێئامانەوە.

ئەرمـەنییەکان بە گەزافەگۆیی کەوتوون و گەورەترین ئەرمەنستانییان دەویـت، ئەمـەش لەبەر ئەوەی کە لە سەردەمی تیگران Tigranدا، پەنجا ساڵ پێـش لـە دایکبوونـی مەسـیح، دەولەتیك بەناوی ئـەرمینیاوە هـەبووە، کـەچی بـە ئانقەسـت ئـەو ڕاسـتییە لـە بـیرە خۆیـان دەبەنەوە، کە مەرزوبوومی وڵاتەکەیان (خۆ بە شیوەیەکی ڕاستەوخۆ پابەندی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانییـەکانیش بـوو) لـە هـەمان سـەردەمی تیگرانـدا، لـە لایـەن Pompeeدا سـەرلەنوێ داگیر کرایەوە.

ئەم سەرنجە، ئیدی چیتر ئەوە بە شتێکی سروشتی نازانێ، کە ئەرمەنییەکان ڕێ بدەنە خۆیان "ئەرمینیای گەورە" بە بێشکەی شارستانیەت و نەژادی خۆیان لە قەڵەم بدەن.

ئەرمەنییەکان، وەك ئەوانەی داکۆکییان سروشتی نازانێ، کە ئەرمەنییەکان ڕێ بدەنە خۆیان "ئەرمینیای گەورە" بە بێشکەی شارستانیەت و نەژادی خۆیان لە قەڵەم بدەن.

ئەرمەنییەکان، وەك ئەوانەی داکۆکییان لێدەکەن، دەیانەوێ داخوازییەکانیان بە ڕەوا بسەلمێنن، بۆ ئەمەش دێن پشت بەو دیاردەیە دەبەستن کە ئیتر گوایە چەند هەزار ئەرمەنییەك ئەمڕۆ لە کوردستاندا دەژین.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم لاف و گەزافانە، ئێمە، دیسانەوە پشت بە بەڵگە و قسەکانی Nuttal دەبەستینەوە، کە دەڵێ:

"ئەرمەنییەکان لە ڕۆژگارە هەرە دێرینەکانەوە، هەمیشە ڕەویان کردۆتە وڵاتەکانی دەوروبەری خۆیان، وەك جوولەکەکان، هەمیشە عەودالی پرۆژەو کاروباری بازرگانین. بەشی هەرە زۆریشیان پووڵدارو خاوەن سەرمایەن. کوردەکان هەرگیز ئەوەیان لە خۆ نەکردۆتە غەم کە ئەو ئەرمەنییانەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا دەژین و هەمیشە مێملی بازرگانین، قازانج و بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەسەر خاکی وڵاتەکەی ئەوان ئەنجام دەدەن. ئیدی ئەرمەنییەکان بەم شێوەیە بە نیازی ڕووتاندنەوەو بەکارهێنانی کوردەکان وایان بەباش زانیوە کە بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە رووبکەنە کوردستان".

ئیدی کەواتە هەر سەبارەت بە هەمان کەڵکەڵەیە کە هەمیشە واشیان بە باشتر زانیوە بێن لە شارەکاندا بژین؛ تەنانەت هەر بە تەواوەتیش کارکردنی مەزراو کشتوکاڵ بە یەکجاری فەرامۆش بکەن.

بۆ سەلماندنی کەمایەتی بوونی ئەم ئەرمەنییانە لە کوردستاندا، دەتوانین پشت بەو گەواهییە ئۆفیساڵە هەرە تازانە ببەستین کە لە لایەن تورکیاو دەوڵەتە ئەوروپییەکانەوە دەرچوون. یەکسەر لە دووای (پەیمانی بەرلین) وەفدێك لەژێر سەرپەرشتی ژەنەراڵی ئینگلیز

بێکر پاشاو سەعید پاشای سەرۆك ئەنجوومەنی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها لە ژێر سەرپەرشتیی یەکێك لە پیاوماقووڵە ناودارە ئەرمەنییەکان، میناسە فەندی، بە نیازی سەرژمێرکردنی دانیشتووان، ناردرایە کوردستان(٧).

لەو سەرژمێریەدا، هێندە بەسە کە تەنیا ئەوەی دیاربەکر بە نموونە بهێنینەوە، چونکە ئەنجامەکەی: لەناو (٨٤٠٠٠٠) دانیشتوواندا، (٦٠٠٠٠٠) موسڵمان دەرچوو بوون، (٢٤٠٠٠٠)یش مەسیحی، یان جوولەکە.

لەساڵی ١٨٩٥دا میر لۆبانۆف Lobanoff، وەزیری کاروباری بێگانان لە ڕووسیا، کە هەڵبەتا زۆر دوورە لەوەی دۆستی کوردان بێت، ساغی کردەوە کە ئەرمەنییەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا تەنیا کەمایەتییەکی نەتەوەیی بچووك پێك دەهێنن.

لە ڕۆژی ٣ی نۆڤەمبەری ١٨٩٥دا (بڕوانە ڕۆژنامەی Journal of- ficiel ،ڕۆژی ٤ی نۆڤەمبەری ١٨٩٦، ل ١٣٥٧-١٣٥٨)، وەزیری کاروباری بێگانان لە گفتوگۆیەکدا لە بارەی مەسەلەی ئەرمینیا کە لەو ماوەیەدا لە خانەی وەزیرانی فەرەنسادا سازکرا بوو، ئەم بانگەوازەی ڕاگەیاند:

(لە شارەکانی تورکیادا، کە ئەمڕۆ تاقە گێروگرفتێکن مشتومڕیان لەسەر دەکرێ، بە پێی سەرژمێرییەکانی بە دەستمان گەیشتوون، گەلی ئەرمەن ژمارەیان هەر چەندێك بێت ،لەکەرتێکی زیاتر لە ١٣٪ی دانیشتوانی تورکیا تێپەڕ ناکا. لە لایەکی دیکەشەوە، مەرزبوومەکانیان لە ویلایەتەکانی ئاسیادا زۆر ناهاوسانە: لە هەندێ شوێندا ژمارەیان زۆرە، لە هەندی شوێنیشدا هەتا بڵێی پرژوبڵاون. بە کورتی ئێمە هیچ هەرێمێك لە شارەکانی تورکیادا بەدی ناکەین کە ئەم میللەتە بەدبەختە بە ڕاستی بەشی هەرە زۆری دانیشتووان پێك بهێنێت، یان توانیبێتی مەڵبەندێك بۆ خۆی پێکەوە بنێت، بۆ ئەوەی لە ڕێگای ئەو مەڵبەندەوە بتواندرێت جۆرە ئۆتۆنۆمییەکیان بۆ سازبکرێت.

لێرەدا بۆ ئەوەی هۆی نارەزایی کوردەکان بە تەواوەتی روون ببێتەوە، ئەم چەند کۆیلەیەی خوارەوە بە نموونە دەهێنینەوە، کە لە نامیلکەیەکی ئامادەکراو لە لایەن سەرپەرشتکاری دەوڵەتی رووسییەوە L, etat- major وەرگێردراون و کاتی خۆی بە شێوەیەکی نهێنی بەسەر تەنیا چەند شەخسیەتێکدا دابەش کراون. ئیدی سەنگینیو بایەخەکەی گومانی لیٚ ناکرێ، چونکە تەنیا لە پێناو کاروباری سەربازی و سیاسەتی رووسیادا ئامادەکراوە. هەر لە سۆنگەی ئەمەشە، کە ئەو نامیلکەیە هەڵوێستێکی بە تەواوەتی بێ لایەنانەی لە هەمبەر کێشەی کورد و ئەرمەنییەکان هەیە. ئامانجی بڵاوکردنەوەی، گەیاندنی کۆمەڵێك زانیاری بووە کە دەبووایە وەك نهێنییەك تەنیا لەنێو خۆیاندا بمێنێتەوە(٨).

لە بارەی ویلایەتەکان، (وان) و (بەتلیس)، ئەو دوو هەرێمەی کە بە قسەی ئەرمەنییەکان (هەر بە تەواوەتی ئەرمەنین)، نووسەر بە راشکاوییەوە دەڵێ:

"لە شاری واندا ٤٦٪ کورد بەرامبەر ٢٦٪ ئەرمەنی هەن. لە شاری بەتلیس ٥٥٪ کورد بەرامبەر ٣٩٪ ئەرمەنی هەن(٩) تورکەکانیش، کە سەر بە هەمان دینی کوردەکانن، لەم دوو ویلایەتەدا، لێرەدا نەدراونەتە پاڵ هیچ کامێکیان.

تەنیا لە شارەکانی وان و مووشدا دەبینین ژمارەی ئەرمەنییەکان کەمێك بەرزدەبێتەوەو دەگاتە ژمارەی دانیشتووانی کوردەکان. لە هەرێمی بەتلیسدا ٥٠٪ کورد بەرامبەر ٤٠٪ ئەرمەنی هەن، بەڵام لە تەواوی هەرێمەکانی دیکەدا، ژمارەی کوردەکان چەندین قاتی ئەرمەنییەکانە. بە کورتی، لە هەر هەرێمێکی بڵێی، ئەرمەنییەکان تەنانەت نیوەی ژمارەی دانیشتووانیش پێك ناهێنن. کوردەمان لە (هەکاری)دا ٥٦٪، لە (سیرت)دا ٦٠٪ن لە (گەنج)دا ٧٩٪ی ژمارەی دانیشتووان پێك دەهێنن.

لەم هەرێمە ناوبراوانەی دواییدا، کوردەکان ژمارەیان هێندە زۆرە کە ئەرمەنییەکانی ئەو ناوچانە، لە زمانی کوردی زیاتر، ناتوانن بە هیچ زمانێکی دیکە بدوێن. تەنانەت لە

هەریمەکانی وان و بەتلیسدا، هەندێ ناوچە هەن کە زمانی ئەرمەنی تەنیا لــە لایـەن پیـاوە دینیەکانەوە بەکاردیت و بەس.

سـەداباری دینـەکانیش لـەم دوو ویلایەتـەدا، بـەم جۆرەیـە: لـــە هـــەریمی وان دا ٥٤٪ موسلمان، ٤٣٪ مەسیحی، ٣٪ئایینی دیکە هەن. لە هەریمی هەکاریدا ٥٦٪ موسلمان، ٤٣٪ مەسیحی، ١٪ ئایینی دیکە هەن.

لـە ویلایـەتی بـەتلیس دا، تەنانـەت لـە هـەموو هـەریمی بەتلیسـدا، ٦٠٪ موســلمان بەرامبـەر ٤٠٪ مەسـیحی هـەن. لـە شـاری مـــووش دا ٥١٪ موسـلمان بەرامبـــەر ٤٨٪ مەسیحی، هەروەها ١٪ خەلکی سەر بە ئایینی دیکە هەن.

لە شاری سیرت دا ٦٥٪ موسلمان بەرامبەر ٣٤٪ مەسیحی و ١٠٪ خـەلکی سـەر بـە ئایینی دیکە هەن. لە شاری گەنج داد ٦٩٪ موسلمان، ٢٠٪ مەسیحی، ١٪ خەلکی سـەر بە ئایینی دیکە هەن.

بە شیوەیەکی گشتی، لەناو هەموو ئەو ٣٢ قەزایــەی کـە ویلایەتـەکانی وان و بـەتلیس پیك دەهینن، ژمارەی مەسیحییەکان تەنیا لە ٨ قەزادا دەگاتە نیوەی ژمارەی دانیشـتوان ، لـە قەزاکانیدیکـەدا، موسـولمانەکان هەمیشـــە ژمـــارەی هـــەرە زۆری دانیشـــتوان پیــك دەهینن"(١٠).

هەموو ئەم سەرژمیرییە رەسمییانە- خۆ لە سەردەمیکیشدا کراون کە سەرتاپای ئەورووپا لــە ســۆنگەی رووداوە تراژدییـــەکانی ئـــەرمینیا لایـــەنگیریی خـــۆی بـــۆ بـــەرژەوەندیی ئەرمەنییەکان پیشان دەدا - روون و ئاشکرا ئەوە دەسەلینن کە ئیتر ئەرمەنییەکان لە هیــچ ناوچەیەکی سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمـانیدا بەشـی زۆربـەی دانیشـتووان Majorite پیـك ناهینن. هەر بۆیەش، هەلبەتە ناکرێ بگوتـرێ کـە ئـەو ئەرمەنییانـە لـە کوردسـتاندا (کـە کوردسـتان بەشـیکی فراوانـی لـە ئیمپراتۆریـەتی عوسمـــانی گرتۆتـــەوە) بەشـــی زۆربـــەی دانیشتووان پیك دەهینن.

لە لایەکی دیکەشــەوە، بـۆ دووایـین بەڵگـە لـە بـارەی سـەلماندنی زۆرتربوونـی ژمـارەی دانیشتووانی کوردەکان لــەو هەرێمانـەدا، پێویسـتە بڵێـم کـە لـەو دوو ویلایەتـەی باسـمـان لێکردن، لە هەمـان کاتدا خەڵکێکی بێشوماری سوارەی حەمیدیە هـەن کـە لـە عەشـیرەتە کوردەکـان پێکـهاتوون، عەشـیرەتی حـەیدەرانلی ۱۰ ( سـەرۆکەکەیان محەمـەد سـادق بـەگ)، عەشیرەتی ئەدەمانلی (عەلی بەگ)، عەشیرەتی موکری (ئیبراهیم بەگ)، عەشیرەتی میــلان (محەمەد بەگ)، عەشیرەتی شەمسیکی Chemsiki (سـادق بـەگ)، عەشـیرەتی Che Kiah شەریف بەگ)، عەشیرەتی ئەدۆمانلی Adomanli (سـولەیمان بـەگ)، عەشـیرەتی تـاکووری Takouri (حوسـێن بـەگ)، عەشـیرەتی ئـەرتووش Ertouche (حەسـەن بـەگ)،عەشــیرەتی ئەدەمانلی Adamli(ئۆشان بەگ)، عەشیرەتی پەنیان Penian (لوتفوڵلا بەگ)، عەشـیرەتی شەیدانلی (عومەر بەگ)، عەشیرەتی Allache، هەروەها حەیدەرانلی (حاجی دەمید پاشا).

عەشیرەتی حەیدەرانلی کە شەش فەوج Regiment لە سوارەی حەمیدیە پێك دەهێنێ لە نێوان رۆژهەڵاتی گۆمی وان و رۆژئاوای زنجیرە چیاکانی ئالآدار Aladarدایە.

عەشیرەتێکی دیکەش هەر بەناوی حـەیدەرانلی هەیـە، کـە پێیـان دەڵێـن Haidaranli Ahaza، لە Dondak و مەلآزگەردو هەرجیشدا دەژین، لـە مەڵبـەندی مەلآزگـەرد ژمـارەی خـەڵکی سـەر بـە عەشـیرەتی حەسـنانلی زۆرتـرن. عەشـیرەتی حەســـانلی لــە دەوروبــەری مەلآزگەردو Boulkanikh Hinsدا دەژین، پێنج فەوجی سوارەی حەمیدییـەیان پێکـهێناوە، سێ لەو پێنج فەوجە لە ویلایەتی بەتلیس دان.

لە مەڵبەندی هەرجیشدا کە دەکەوێتە قەراغ رووباری زەیلان، عەشـیرەتی Hidmnalilar دەژین. عەشیرەتی جەبدانلی-ش دوو فەوجی "سوارەی حەمیدیە" پێك دەهێنن و لـە قـەزای Vartouدان. هەرچی عەشـیرەتەکانی دیکـەش، ژمارەیـان لـەچاو ئەوانـەی سـەرەوە کـەمترە، هەریەکەشیان لە فەوجێك زیاتر پێك ناهێنن.

عەشیرەتی Chanli لە قەراغی ڕۆژهەڵاتی گۆمی وان دا دەژین. عەشیرەتی Takouri لە شاری (سەرای) هەروەها لە قەزای (مەحموودییە)دا دەژین کە دەکەوێتە سەر سنووری وڵاتی فارس، عەشیرەتی میلانلی لە هەمان کەوشەندا دەژین ، بەڵام هەندێك بەلای ڕۆژ ئاوا٠ عەشیرەتی موکریش بەهەمان شێوە لە هەمان ناوچەدان٠ عەشیرەتی Chemsighi لە قەزای مەحموودییە و حەمیدییەدان. عەشیرەتی Chekiah لە قەزای Alpakدان، کە دەکەوێتە ژوورووی ڕووباری Zab، عەشیرەتی شەیدانلی لە قەزاکانی حەمیدییە و Nourchenدا دەژین، هەروەها عەشیرەتی Aladje لە ناوچەی مەلازگەردم و ئەرجیش دا دەژین.

جگە لەو عەشیرەتانە، عەشیرەتی دیکەش هەن، کە بایەخیان لە پلەی دووەم دایە، هەریەك و چەند فەوجێکیان لەو هەرێمانەدا پێکهێناوە.

هەموو ئەو عەشیرەتانە، سەرەڕای هاوسازییان لە ڕووی سیستەمی بەڕێوەبردنی ناوخۆیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش نەیانتوانیوە سەرۆکەکانی خۆیان بگەیەننە باوەڕی ئەوەی کە داوای سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە حکومەت بکەن، ئەو عەشیرەتانە، هەر بە سروشتی سەرکەشانەی خۆیانەوە، هەستی دڵبلندییەکی پتەو ڕەگاژۆی نەریتی نەتەوەییان بووە، هەمیشە حەز لە سەربەخۆیی نەتەوەیی دەکەن.

ئیتر ئەو کەمایەتییە نەتەوەییەی ئەرمەنییەکان، ئەگەر تەنانەت هێزێکی ئەورووپایشیان لە پشت بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بێهوودەیە لاف و گەزافی ئەوە لێبدەن کە بتوانن ئەم گەلە جەنگاوەرە، کە ژمارەی دانیشتووانیان زۆر لە ئەوان زیاتریشە، بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

موژدەگارە مەسیحییەکان Missionnaires Les کە بۆ یەکەمین جار بە کەڵکەڵەی دینەوە پێیان نایە خاکی کوردستان، لە سەرەتادا بە کوردەکان دەستییان پێکرد: بۆ ئەوەی بیانهێننە سەر ئایینی خۆیان، بەڵام کاتێ دەم و دەست هەستیان کرد کە سەرکەوتنی

پرۆژەکەیان ئاستەمە، ئیتر بۆ دریژەدان بە کۆششی خۆیان روویان کردە عەشیرەتە مەسیحییەکانی کوردستان، لەناو ئەم عەشیرەتانەشدا، ئەرمەنییە ئۆرئۆدۆکسەکان لە هەموو کەسیك زووتر و ئاسانتر و چوونە ژیر بارەوە. تەنانەت هیندەی پینەچوو کە قوتابخانەی ئەو موژدەگارە مەسیحییانە پرکران لە قوتابییە ئەرمەنییەکان.

موژدەگارەکان بە نیازی ئەوە هەست و نەستی بەرزەفرانەی ئەرمەنییەکان بوروژینن هاتن میژووی تیگران و هەروەها لیکۆلینەوە لە شەرو شۆرەکانی تیگران و ئیمپراتۆریەتە کۆنەکەیان کردە بابەتی قسەکانی خۆیان.

لە ئاکامی ئەم پەروەردەکارییە لیوانلیوەی هەستی نیشتمانپەروەری، بۆ یەکەمین جار بیری (سەربەخۆخوازی) لە لای ئەرمەنییەکاندا سەرهەلدەدا، هەلبەتە، جار بیری• (سەربەخۆخوازی) لەلای ئەرمەنییەکاندا سەرهەلدەدا، هەلبەتە، بیئەوەی ئیمە توانیبیتمان پیشبینی بایەخ و سەرەنجامەکانی ئەم دیاردەیە بکەین.

لە بارەی موژدەگارەکانەوە، دیسان پەنادەبەمەوە بەر نامیلکە رووسییەکەی major-etatj L، ئەم رستانەی لیوە دەگوازمەوە:

(لە ویلایەتەکانی واندا، موژدەگارە کاتۆلیك و پرۆتستانتەکان، لە سی سال لەمەوپیشەوە، رەگ و ریشەی خۆیان لە مەلبەندە گرنگەکاندا، هەروەها لە ناوجەرگەی هەر دوو شاری وان و بەتلیسدا دامەزراندووە. لەناو ئەوانەدا، ئەرمەنییەکان لە پیش هەموو کەسیکەوەن کە پرۆپاگەندەی ئایینی دەکەن و بە هانای هەژارانەوە دەچن، بی ئەوەی گوییش بدەنە نەژادو دینیئەو هەژارانە، هەروەها قوتابخانەکانیشیان لە رووی ریکخستنەوە لە هەرە باشترین قوتابخانەکانن. لە قوتابخانەی موژدەگارەکانی شاری وان و بەتلیسدا، هەندی لقی پیشەوەری Sections Industrie کراونەتەوە. کە پیشە جۆراوجۆرەکان لەو قوتابخانەدا بە دەرس دەگوترینەوە).

شایانی سەرنجە، ئەو خوێندنگا ئەمریکاییانەی کە خوێندکارە ئەرمەنییەکان رووی تێدەکەن، پێش هەموو کەسێك باربووی ئەو خوێندکارانە دەکەن کە شۆڕشگێڕی هەرە سەرەزاو کارامەی دنیان بۆ پڕوپاگەندەو بانگاشەکردن. ئامریکاییەکان، سەرەڕای ئەوەی کە چەندەی پێیان بکرێ پارەو سامانی خۆیان لەو ئەرمەنییانە خەرج دەکەن، بەڵام ئەرمەنییەکان خۆشیان ناوێن.

ئەرمەنییەکان کە هەر بە شێوەیەکی زگماك، چاو پرسێتییەکی بازرگانییانە پاڵیان پێوەدەنێ هەمیشە لە بەشی خۆیان زیاتر داوا بکەن، ئەمڕۆ هاتوون زۆر لەوە زیاتریان داواکردووە کە یاسا بتوانێ جێبەجێی بکات. لەوە دەچێ ئیمپراتۆریەتەکەی جارانیان بەلاوە زۆر بچووك بێت، حەزدەکەن بەشێکی فراوانی کوردستانیش، کە ئەمڕۆ وەبەر ئاسیای بچووك کەوتووە، بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، ئەمەش بە یادی ئەو سەرکەوتنە راگوزارییەی کە رۆژی لە رۆژان پاڵەوانە ناوادارەکەیان، تیگران، لە مێژووی نەتەوەییاندا وەدەستی هێنابوو.

دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەوروپا (لە رێگای دەست تێوەخستنی کاروباری ناوخۆیی رژێمی حەمیدەوە) بەردەوام فشاری خستۆتە سەر، ئەوەی بە پێویستە زانی کە رێگا بداتە ئەرمەنییە نارازییەکان، ئەگەر بیانەوێ ولاتەکەی خۆیان بەجێ بێڵن یان واز لە رەگەزنامەی عوسمانیی خۆیان بهێنن، ئیتر لە ئەنجامی ئەوەدا، هەزاران ئەرمەنی سەری خۆیان هەڵگرت و رەویان کرد بەرەو مەڵبەندەکانی ئیمپراتۆریەتە کۆنەکەی جارانیان، ئەو مەڵبەندانەی کە بە پێی بەندەکانی (کۆنگرەی بەرلین) خرابوونە سەر ئیمپراتۆریەتی قەیسەرەوە.

وەك دەردەکەوێ، بەشی هەرە زۆری ئەو ئەرمەنییە رەوکردووانە عەردەکانی خۆیان بە کوردەکان فرۆشت، هەروەها بەشێکی دیکەشیان هەر لە خۆیانەوە زەوی و زارەکانی خۆیان بەجێهێشت.

بە پێی قانوونی عوسمانی، هەر پارچە عەردێکی بەبار (تۆونەکراو) ئەگەر تاکو سێ ساڵان لە لایەن زەویدارێکەوە کاری تێدا نەکرێت، ئەوا زەویدارێکی دیکە بۆی هەیە دەست بەسەر ئەو پارچە زەوییەدا بگرێت، یانیش لە لایەن دەوڵەتەوە بفرۆشێت. ئیتر ئەو زەوی و زارانەی کە ئەرمەنییەکان بەجێیان هێشتبوو، بەم شێوەیە فرۆشرایە کوردەکان.

دووای ڕاگەیاندنی ڕژێمی دەستووری (مەشرووتیەت ١٩٠٨). ئەو ئەرمەنییانەی بەرەو ڕووسیا پەڕاگەندە ببوون، سەبارەت بەوەی ڕژێمی قەیسەریی ڕووسیایان لە چاو ڕژێمی تورکیا کوشندەتر و سەختتریش بۆ دەرکەوتبوو، هاتن ڕوویان کردە ئەمنیستی گشتی Amnisue Generalc کەوتنە دەست و پەل کوتانی ئەوەی کە مەرزوبوومی زێدی خۆیان بخەنەوە ژێر ڕکێفی خۆیان، بۆ ئەمەش هاتن داوایان لە دەوڵەت کرد بۆ ئەوەی ئەو زەوی و زارانەی "بە ناهەق" کەوتبوونە دەست زەویدارە تازە کوردەکان، بدرێنەوە خۆیان.

ڕژێم کە هەمیشە لەژێر کاریگەرێتیی داخوازییە زێدەڕۆکانی دیپلۆماسە ئەوروپییەکاندا بوو، ناچارکرا دەست لەو زەوی و زارانە بکشێنێتەوە، بەڵام کوردەکان کە لە دەست ئەم ستەمە کەللەیی ببوون، بە هەموو توانای خۆیان ڕووبەڕووی ئەم تەرزە ڕەفتارە وەستانەوە. کاتێ جەنگی جیهانی دەستی پێکردن کۆمیسیۆنێکی ئەورووپایی تایبەت، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەو ناتەباییە، چووە ئاسیای بچووك و کوردستان.

هەموو ئەو شتانە، بە ئاشکرا ئەوە دەسەلێنن کە بەشی هەرە زۆری ئەو ئەرمەنییانەی لە کوردستان دەژیان، بە خواستی خۆیان ئەو وڵاتەیان جێهێشتووە، کەواتە لە ڕووی یاساوە چیتر مافی ئەوەیان نییە داوای ئەو هەرێمانە بکەنەوە.

ئەگەر زۆربەی نەتەوەیەك نەیتوانی بێ کەمایەتییەکی نەتەوەیی بە شێوەیەك بەڕێوە بیات کە ئەو کەمایەتییە نەتەوەییە پێی ڕازی بێت، ئایا ئەمە بە شتێکی ڕەوا دەزانرێت کە ئەمرۆ ئەو کەمایەتییە نەتەوەییە ڕێگای پێ بدرێت بەڕێوەبردنی نەژادێکی وەکو نەژادی

کورد، کە ژمارەیان زۆر لە ئەوانیش زیاترەو هەمیشە حەز لە سەربەخۆیی و ئازادی دەکەن، بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە؟

لە لایەکی دیکەوە، کۆمیسیۆنێکی سەر بە چەندین وڵاتانی ئەورووپی، پێویستە لە مەسەلەی گەڕاندنەوەی سامانی لە دەستچووی ئەرمەنییەکان بکۆڵێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر ئەرمەنییەکان ئارەزووی ئەوە بکەن کە بەرەو ئەرمینیا کۆچ بکەن، هەروەها ئەگەر ئەو کۆمیسیۆنە ڕەزامەندیی کوردەکانیش وەربگرێت.

بە پێچەوانەی پرنسیپەکانی ویلسن Wilson، ئەمڕۆ هەموو شتێك دژی کوردەکان دەکەوێتەوە، واتە دژی ئەوەی کە ئەمڕۆ دەوڵەتێکی ئازاد و سەربەخۆیی کوردی دروست ببێ.

هەر چواردە بەندەکانی ویلسن Wilson کە سەرتاپایان لە لایەن ڕژێمی عوسمانییەوە قەبووڵ کراون، کوردەکان وا لێدەکەن (ئەو بەندانە بە ڕاستی مافی ئەوەی پێ بەخشیون) کە بێن داوای سەربەخۆیی خۆیان بکەن، ئەمەش بەبێ هیچ پاداشت دانەوەیەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی؛ ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە کوردەکان، هەمیشە بە دەم پاراستنی داب و نەریتی خۆیانەوە، بە درێژایی چەندین سەدە لەژێر سایەیدا ژیاون.

ئەوەتا، ئێستا، ئەمەیە پوختەی داخوازییەکانی کوردەکان، کە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو سەرنجانەی سەرەوەدا هەڵمانهێنجاون.

ئێمە بە توندییەوە نارەزایی خۆمان دەردەبڕین لە هەمبەر داخوازییە دەستدرێژکارییەکانی ئەرمەنییەکان بۆ سەر خاکی کوردستان، ئەو کوردستانەی کەلە چوارچێوەی سنوورەکانی خۆیدان وەك لەو نەخشەیەی پاشان پیشانی دەدەین، پێویستە تەنیا بۆکوردەکان- خۆیان بمێنێتەوە.

سەبارەت بەوەی کە سامانی نەتەوەیی کوردەکان تەنیا بەخێوکردنی مەڕوماڵاتە و هەروەها ئاوو هەوا ناچاریان دەکات کە بۆ دۆزینەوەی لەوەڕگاو پاوانەکانیان گەرمیان و

کویستان بکەن؛ ئیمە لە پیناو مسۆگەرکردنی ژیانی ئەم گەلەو پاراستنیان لە دەست نالەباری و چورتمی ئابووری، سوورین لەسەر داواکردنی خۆمان لەوەی کە ئەو پاوان و میرگانە نەخرینە دەرەوەی ئەو سنورەی بۆ کوردستان دیاری دەکرێ.

لە کۆتاییدا ئیمە داوای سەربەخۆبوونی خۆمان دەکەین، ئەمەش مافیکی رەوای (قانوونی) خۆمانە، تەنیا ئەم سەربەخۆبوونەشە ریگامان دەداتێ لە پیناو پیشکەوتن و گەیشت بە شارستانیەتدا کۆشش بکەین، هەروەها بتوانین بەهرە لە سامانەکانی ولاتەکەمان وەربگرین و لەگەڵ دراوسیکانماندا بە ئاشتی بژین.

ویرای ئەمەش، ئیمە ئاواتەخوازین کە کۆنفرانسی ئاشتی، کۆمیسیۆنیکی نیودەولەتی پیك بهینیت. ئەو کۆمیسیۆنە ئەرکی ئەوە بیت کە سنوورەکانی کوردستان، بە پیی پرنسیپی نەتەوایەتییەکان Le, Prin cipe des Nationlites بە شیوەیەك دیاری بکات کە سەرتاپای هەریمە کوردنیشنەکان بگریتەوە: ئەو هەریمانەی کە کورد ژمارەیان لەچاو ژمارەی میللەتانی دیکە زیاترە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەگەر لەو هەریمە دیاریکراوانەی دەدرینە پال کوردستان کۆمەلە خەلکیکی غەیرە کورد هەبن، ئەوا ئەو کۆمەلە خەلکە مامەلەیەکی تایبەتی وایان لەگەڵ دەکرێ کە لەگەڵ داب و نەریتی نەتەوایەتییان پیکەلپیك ببیتەوە.

ئیمە هیوایەکی زۆرمان بە دادپەروەرایەتی ئەم کۆنگرەیە هەیە، ئیدی ژیان و داهاتووی گەلیکی دیرینی پێ دەسپیرین: ئەو گەلەی، کە ئەگەر ریگای پی بدریت، پاش دەزانێ کە چۆن ریگای بووژاندنەوەی خۆی پەی بکات.

**پاریس ٢٢ مارس ١٩٩٩**
**ژەنەرال شەریف پاشا**
**سەرۆك وەفدی کوردان**
**لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس**

## پەراویزو سەرچاوە:

١-ماوەیەك بوو لە وەرگیرانی ئەم دۆكۆمینتە بۆ كوردی ببوومەوە، لە ناكاو چاوم بە كتیبەكەی د. بلەچ شیركۆ كەوت (كیشەی كورد، میژینە و ئیستا) كە بەریز كاك حەمەی حەمە باقی لە عەرەبییەوە كردوویەتی بە كوردی. لیرەدا، بەلكو لەبەرئەوە نا كە ئەم تیكستە تەرجەمەكراوەی بەردەست لە سەرچاوە فەرەنسییە ئەسلییەكەوە كراوە؛ لەبەرئەوەی - دووای بەراوردكردنیكی وردی نیوان هەر دوو تیكستەكە (تەرجەمەكەی خۆم و تەرجەمەكەی كاك حەمە باقی)- بۆم دەركەت كە وەرگیرانە لە زمانی عەرەبی كراوەكەی كاك حەمە باقی، لە گەلیك شویندا شتی لە خۆرای لی زیادكراوە، یانیش زۆرجاران لیی كەم كراوەتەوەو دەسكاری كراوە. ئەمە جگە لە هەلەو پەلەی ئامار و سەرژمیرییەكان، بە هەلە نووسینەی ناوی جیگاو شارو هۆزە كوردەكان. هەرچۆنیك بی، وەرگیرانە لە زمانی عەرەبی كراوەكە هەم شیواز و هەن ناوەرۆك و بیری یادداشتنامەكەیان شیواندووە.

ئیمە لە كاتیكدا دلنیاین كە بنچینەی ئەم هەلە و كەموكورتییانە. دەگەریتەوە بۆ تەرجەمە عەرەبییەكە (نەك بۆ كاك حەمە باقی)، هیواداریین ئەم وەرگیرانەی بەردەست كە راستەوخۆلە فەرەنسییەوە كراوە، هەم بۆ رووناكبیر و میژوونووسانی كورد، هەم بۆ چاپی داهاتووی ئەو كتیبە سوودیك بگەیەنی.

ئیمە ئەم دۆكۆمینتەمان لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوەتە سەر كوردی:

**-Memorandum sur Les Revendications du pcu ple Kurde, imprimerie A.G.L, HOIR; 26, Rue du Delta 26. Paris: 1919. (15 pages).**

٢-شەریف پاشا لە نووسینەكەدا زاراوەی Nation (نەتەوە)ی بەكارهیناوە بۆ كورد، نەك Peule (گەل).

٣-نـاوەرۆكی ئـەم یاشداشـتنامەی ئـەوە پیشـان دەدا كـە ژەنـەرال شـەریف پاشـا شارەزاییەكی قوول و فراوانی لە بارەی میژووی كۆنی نەتەوەكەی خۆی هەبووە.

٤-پیش ئەم یاداشتەی شەریف پاشا، ئەرمەنییەكان یاداشـتیكیان بـە نـاوی داخوازییـە سیاسیە (نیشتمانییەكانی) ئەرمەنییەكانەوە پیشـكەش كردبـوو. لـەو یاداشـتەی خۆیـاندا، بەشیكی زۆری خاكی كوردستانیان بەگەڵ (ئەرمینیا)دا بوو.

٥-ئەم سەرچاوەیە، كە شەریف پاشا پشتی پێ بەستووە، ئەمەیە:

RECLUS Elisee: Nouvelle Gcographic Universelle, La terre et Les hommes, Paris: 1879- 1894.

جلدی نۆیەم، بە ناونیشانی (L, Asie Anterieur).

كۆد و ژمارەكەی لە كتێبخانەی لانگزۆ لە پاریس (MN. 4-2)

٦-ئەم پرنسیپ و یاسایە، ویلسۆن لە دوای كۆتایی جەنگی یەكەمی جیهانیی دایهینا كە هەر نەتەوەیەك لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا پیویستە دەولەتی خۆی هەبێ.

٧-بـۆ سـەرژمیریی كـوردو ئەرمـەن هـەروەها جوگرافیـای كوردسـتان و ئـەرمینیا لـە سەدەی نۆزدەهەمدا بروانە ئەم دوو سەرچاوەیە بە زمانی عوسمانی:

-علـی امـیری دیـاربكر الی: عثمـانلی ولایـات شرقیەسـی. اسـتانبول، اقبـال كتابخانەسی، سالی چاپ (١)، ١١٢ لاپەرەیـە، كۆدی لـە كتیبخانـەی لانگـزۆ لـە پـاریس (٢٧) Mel 8- 659.

-سـعادتلو سـعید پاشـا: سـالنامە ولایـت دیـاربكر، قسـم ثـانی، اسـتانبول (١٣٠٢هـ)(كۆدو ژمارەی لە كتیبخانەی لانگزۆ لە پاریس: Tur. 111. 635.

٨-بروانە:

Statstique de vanet de bitlis, traduit du russe Par Mehemed Sadik Bey, Commandant de Cavalerie, auache au bureau de renseignements de L, etat, Major general. Imprimerie militaire, Constantinople, 1330 (1924).

ئـەم کتیبـە لـە بنچینـەدا بـە رووسـی نووسـراوە لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەم دا بـە ناونیشانی سەرژمێری دانیشتووانی وان و بەتلیس. محمد صادق بەگ لە رووسییەوە کردوویە بە فەرەنسی.

۹-ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام دەڵی کە شـاری بـەتلیس ناوجەرگـە و مـەڵبـەندیکی هـەرە سەرەکیی کوردستانە. بروانە وشەی بەتلیس (BIDLIS) لە سەرچاوەی ناوبراودا:

Encylopedie de e, Islam, Dictionnaire Gcographique, Ethno., et Biogr., des Peuplcs muslmans, T. 1 (A-D), (Bedlis), PP, 733- 734., Paris: 1913.

۱۰-بروانە پەراویزی ژمارە (A).

# ژەنەراڵ شەریف پاشا:
# یەکەمین کورد کە نەخشەی کوردستانی گەورەی وێنە کێشاوە

شتێکی سەیر نیە کە شاعیرێکی کورد، (عەبدولخالیق ئەسیری) لە ساڵانی سییەکاندا، سەرتاپای شیعرێکی خۆی بۆ دیاریکردنی سنوری جوگرافیای کوردستان تەرخان کردبێت·(١). هۆی ئەمە، بێگومان ئاشکرایە: لەو سەردەمەدا ئێمەی کورد، سەبارەت بە کلۆڵیی رۆشنبیریمان و نەبوونی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی و کارتۆگرافی، هیچ هۆشیارییەکی سیاسیمان لە بارەی جوگرافیای نیشتمانەکەی خۆمان نەبوو، ئەم شیعرەی عەبدولخالیق ئەسیری، ئەمڕۆبۆ ئێمە جێگای جوانترین نەخشەی جوگرافیای کوردستانی گرتۆتەوە.

جوگرافیاناسەکان هەمیشە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە شارەزاییو ئاگاداریمان لە بارەی جوگرافیای نیشتمانەکەمان؛ لە ئاکامدا دەتوانێ ببێتە هۆشیارییەکی سیاسی، ببێتە ئامرازێکی دەسەڵات پەیداکرد، رۆڵێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی ببینێ(٢).

ئەمڕۆ، نەخشەی جوگرافیای کوردستان، لە عێراقدا لکاوەتە دەوڵەتی عێراق، لە ئێراندا لکاوەتە دەوڵەتی ئێران، لە تورکیادا لکاوەتە دەوڵەتی تورك، لە سوریا بەشێکە لە سوریا.. هتد. ئەم واقیعە بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زانستی جوگرافیا، زانستی نەخشە دارشتن یان نەخشە سازی Car tographie زانستێکی بێلایەن نییە(٣). وەك مێژونووس (ستاریۆن) دەڵێت: "زانستی جوگرافیا لە بنچینەدا بۆ پێداویستییەکانی ژیانی سیاسی بەکاردەبرێت".

کەواتە نەخشە Carte تـەنیا ئـەوە نییـە کـە شـوێنی جوگرافـی وڵاتێـك یـان کۆمەڵـە خەڵکێك یان شـوێنی جوگرافـی دەریاچەیـەك بـۆ تووریسـتەکان یـان بـۆ قوتابییـانی پـۆلی سـەرەتایی ڕوون بکاتـەوە، بـەڵکو ئـەمڕۆ وەك چـەکێکی ئـایدیۆلۆژی و مێشکشـوتنەوە بەکاردێت، یەکێکە لە ئامرازە گرنگەکانی خـەباتی ئـایدیۆلۆژیو دەربڕینـی سیاسـی، وەك تێکستێکی نووسراو، یان وەك وێنەیەك کە چەند ڕاستیو زانیارییەکمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

لـە بـارەی یەکـەمین نەخشـەی جوگرافیـای کوردسـتان کـە لـە لایـەن کـورد خۆیـەوە دروستکرابێ، ئاگادارین کەلە کتێبی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەتلیسیدا گەلێك مینـاتۆر بـۆ وەسـفکردنی شـەڕو شـۆڕەکانی کـورد، بـە تایبـەتی بـۆ پیشـاندانی شـەڕی چـالدێران (١٥١٤) شەڕی ئاق قۆینلوو.. هتد دروستکراون(٤)بەڵام بە داخـەوە لـەو کتێبـە گرنگـەدا هیچ نەخشەیەکی جوگرافی کوردستان دروست نەکراوە.

ئیدی نووسەری کورد لەوە دەچێ هەر لە کۆنەوە تاکو سەرەتای ئەم سەدەیە، ئەم زانست و تەکنیکی دەربڕینەی هێندە بەلاوە گرنگ نەبووبێ، ئەمەش لەوانەیە لەبەرئـەوەی نەخشـە، پێـش هـەموو شـارەزاییەکی قـووڵ و فـراوان و لـە بـارەی ئـەو بابەتـەی کـە دەیخەیتـە سـەر نەخشەکە(٥).

یەکەمین ڕووناکبیری کورد کە لە بایەخ و زمانی نەخشە تێگەیشـتبێت و نەخشـەی وەك ئامرازێکی دەربڕیـن بـە ئـەرك خستبێت، سیاسـتمەداری بـە ناوبانگمـان شـەریف پاشـایە (١٨٦٥-١٩٥١)، کە لە ساڵی ١٩١٩دا بۆ یەکەمین جار نەخشەیەکی کوردستانی گەورەی دروستکردو لە نامیلکەیەکدا بـە ناونیشـانی (داخوازینامـەکانی گـەلی کـورد) بـە زمـانی فەرەنسی چاپ و بڵاوی کردەوە. نوسخەیەکیشی لەم نامیلکەیە، لە شێوەی یاداشـتنامەیەك پێشـکەش کـرد بـەو کۆنفرانسـی ئاشـتی لـە پـاریس لـە سـاڵی١٩١٩دا: بـۆ دامـەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ گەلی کورد(٦).

بەم شێوەیە، ئەم نەخشەیەی کوردستانی گەورەی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا، بە یەکەمین نەخشەی جوگرافی- سیاسی لە قەڵەم دەدرێ کە کورد- خۆی دروستی کردبێ. هەر لەم نەخشەیەوە، دەتوانین دەرك بە سەرەتاکانی بیری نەتەوەیی کورد بکەین کە بە شێوە هاوچاخەکەی نەتەوە- دەوڵەت سەری هەڵدا. ئەمەی لێرەدا پێشکەشتانی دەکەین، نەخشەکەی شەریف پاشایە:

## سەرچاوە:


١-گۆڤاری (هاوار) ژمارە ١١، ل ١٤ دیمەشق ١٩٣٢.

2-Vietor Prevot: A quoi Sert la geo graphie ed du Centurion, Paris: 1981. p 52.

3-Fernand Loly La Cartographie Que sais je N 937, P. U, F Paris: 1985. p 6.

٤-عبدالرقیب یووسف: تابلۆکانی شەرەفنامە، هەولێر: ١٩٩٩.

5-Vietor PREVOT. p 53

6-cheri f pacha: memorandum sur les revanbdications dn peuple Kurde, lmpr, a g- 1, hoir, paris: 1919, 15 pages.



نەخشەکەی شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس ١٩١٩

د. فەرهاد پیربال

# دەنگدانەوەی یاداشتنامەکەی ژەنەراڵ شەریف پاشا لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (کوردستان) ئەستەمبول: ١٩١٩

ئەم ڕووداوە سیاسییە مەزنە، ئـەم هەڵوێسـتەی ژەنـەراڵ شـەریف پاشـا لـە کۆنفرانسـی ئاشتی لە پاریس، لەناو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی، عـەرەبی، ئەرمـەنی، فارسـی، تورکـی، ئینگلیزی و فەرەنسییەکاندا دەنـگ دەداتـەوە. گۆڤـاری کوردسـتان (ئەسـتەمبۆڵ ١٩١٩-١٩٢٠) لە ژمارەکـانی (٤،٥،٦) بایـەخی پێـداوە؛ ئینجـا لـە ژمـارە (٩)ی ڕۆژی (١١)ی حوزەیرانـی ١٩١٩دا بەشـی یەکـەمی یاداشـتنامەکەی بـە زمـانی تورکـی بڵاوکردۆتـەوە. هەروەها ژمارەکانی گۆڤـاری ژیـن (ئەسـتەمبۆڵ ١٩١٩) بایـەخێکی تایبـەتی داوەتـە ئـەم ڕووداوە مێژووییە.

لە ریزی ڕۆژنامـە تورکییـەکاندا، ڕۆژنامـەی اقـدام (ئەسـتەمبۆڵ: ١٨٩٢-١٩٢٠) لـە زۆربەی ژمارەکانی ئەو کاتەدا بە فراوانی باسی کردووە، لەوانە: لە ڕۆژانـی( ١٦ی نیسـانی ١٩١٩، ٢ی شـوباتی ١٩١٩)، ژمارەکـانی (٧٩٦٨)، (٧٩٢٦)، (٧٩١٦)، (٧٩٦٨)، (٧٨٩٥) بە فراوانی باسییان کردووە.

لێرەدا هەندێك لـەو دەنگوباسـانەی چالاکییـەکانی ژەنـەراڵ شـەریف پاشـا کـە لەسـەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (کوردستان)دا تۆمارکراون دەخەینـە ڕوو. گۆڤـاری (کوردسـتان)، لـە ئەسـتەمبۆڵ، هەفتـەی جـارێك، لـە سـاڵانی ١٩١٩- ١٩٢٠دا بڵاوکراوەتـەوە. سەرنووسەرەکەی: محەمەد شەفیق ئەرواسی زادە، خاوەن ئیمتیاز: محەمەد میهری، بـە زمـانی تورکیو کوردیو عەرەبیو فارسی بووە.

**لە ژمارە (٦)، ٢٢ی نیسانی ١٩١٩:**

-شؤنات، شریف پاشانك بیاناتی، ل ٧١-٧٢، وتارێکە لە بارەی چالاکییەکانی شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی- لە پاریس، هەڵوێستی ئەم و (کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی) لە هەمبەر مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، بە زمانی تورکی، لە گۆڤاری (اقدام)ی تورکیەوە وەرگیراوە.

**لە ژمارە (٩)، ١٢ی ڕەمەزانی ١٣٣٧ (١١ی حوزەیرانی ١٩١٩ ) :**

بابەتەکان بە زمانی تورکیی عوسمانی نووسراون، وەك چۆن د. خەزنەدار لە ژمارە ٤٣-٤٤ی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان دا لە بەغدا، ساڵی ١٩٧٧ تەرجەمەی کوردیی کردوون، ئەمانەن:

-برووسکەیەك لە شەریف پاشاوە:

برووسکە و نامەی ڕۆژی ٢٣ی نیسانتانم وەرگرت. من ئامادەم هەرەوەزی لەگەڵ دەستەو دایرەی عارف پاشا بکەم لە پێناوی پاراستنی مافی نەتەوەکەمان، یاریدەی فەخری عەبدی بەگ دراوە بۆ ئامادەبوونی لە پاریس.

**شەریف پاشا**

**٢٦ی مایس**

-برووسکە

*لە قاهیرە، پاش ڕێکخستنی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان هەیئەتێك بە سەرۆکایەتی عارف پاشا لە ڕۆشنبیرانی کورد پێکهێنراوە، بۆ ئەم مەبەستە مەڵبەندی گشتی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان ئاگادار کراوەتەوە. مەڵبەندی گشتی لە کۆبوونەوەی تایبەتیدا هەموو مافێکی بەم هەئیەتە دا بۆ ئەوەی بچێ بۆ پاریس و لەگەڵ شەریف پاشا تەقەلایەك بخات. هەروەها ئەم هەواڵە بە شەریف پاشاش گەیەنراوە.

# ژەنەراڵ شەریف پاشا
# لەناو تۆماری ئەرمەنییەکاندا

سەردەمی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) بۆ هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە عەرەب و فارس و ئەرمەن و تورك و کوردیشەوە، بە سەردەمێکی هەتا بڵێی گرنگ لە قەڵەم دەدرێ. بە تایبەتی بۆ گەلی کوردی ژێر دەست، کە وڵاتەکەی، لەو سەردەمەدا بە قۆناغێکی هەژێنەر و ڕاچەنیوی پڕ لە تراژیدیاو کارەساتی جۆراوجۆر تێپەڕ دەبوو. هەر لەو سەردەمەشدا بوو، واتا لە دووای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، کوردستان سەر لەنوێ بە شێوەیەکی تازە دابەش کرایەوە، نەخشەیەکی سیاسی جوگرافیی تازە بەسەردا سەپێنرا.

گەلانی تورك، عەرەب، ئەرمەن، فارس، لە و سەردەمەدا هەر یەکەیان چ لە ناوەوە چ لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیاندا (لە ئامریکا، لە لەندەن، لە پاریس، لە ژنێڤ..) هەریەکەیان چەندین بولتەن و تۆمار و بڵاوکراوەی تایبەتی نەتەوەیی خۆیان هەبووە، هەموو دەنگ و باس و دۆکیومەنت و ڕاستییە مێژووییەکانیان لە بارەی جموجۆڵی کولتووری و سیاسیی وڵاتەکەی خۆیان لەو تۆمارانەدا پاراستوون، کەچی گەلی کورد، بە پێچەوانەی ئەو میللەتانە، لە چەند ڕۆژنامەیەکی پەرپووت بەملاوە کە لەو سەردەمەدا تاك و تووك لە ژێر سانسۆری ئەو دەوڵەتانەدا دەریان کردوون- کەئەوانیش ئەمڕۆ نوسخەکانیان زۆر بە دەگمەن دەست دەکەون- هیچ تۆمارو بڵاوکراوەیەکی سەربەخۆی ئەوتۆی نەبووە کە ئەمڕۆ

مێژوونووس و تۆژەرەوەی کورد بتوانێ بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی کولتووریو سیاسیی ئەو سەردەمەی گەلی کورد پشتیان ببەستێ(۱).

یەکێك لە سەرچاوە بایەخدارەکان بۆ کۆڵینەوە لە بزووتنەوەی سیاسیی کورد، تۆمار و بولتەن و بڵاوکراوەی گەلە دراوسێکانی کوردن، بە تایبەتی تۆمارو بڵاوکراوە ئەرمەنیو تورکیەکان، لەبەرئەوەی ئەم دوو میللەتە لەو سەردەمەدا پەیوەندییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی راستەوخۆیان بە میللەتی کورد هەبووە.

تۆماری ئەرمەنییەکان Bulletin Armenien کە تۆمارێکی سیاسی- کۆمەڵایەتی ئەرمەنییەکان بووەو بە شێوەی گۆڤار، چەند جارێك لە ماوەی ساڵانی ۱۹۱۹-۱۹۲٤ لە پاریس بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە، بە یەکێك لەو سەرچاوە هەرە گرنگانە دەژمێردرێت، کە تۆژەری کورد بتوانێ زانیاری و بەڵگە و راستییە مێژووییەکان لە بارەی ژیان و بزووتنەوەی گەلی کورد لەو سەردەمەدا هەڵبهێنجێنێ.

لاپەڕە درەوشاوەکانی ئەم تۆمارە ئەرمەنییە Bulletin Armenien چەند تیشکێکی تازە لە دیدێکی ئەرمەنییەوە، دەخەنە سەر ژیانی تاریکی بزووتنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووریی گەلی کورد لەو سەردەمەدا.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بەشێك لەو دۆکیومەنتە دانسقەیە، تەنیا ئەوانەی لە بارەی جموجۆڵ و چالاکییەکانی ژەنەراڵ شەریف پاشا نووسراون، لە زمانی فەرەنسییەوە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی:

## کورتەی هەواڵ

کۆمیتــە کوردییەکــە Le comite Kurde ڕایگــەیاندووە کـــە کوردەکـــان هیـــچ پەیوەندییەکیان بە هێزە ناسیونالیستەکانەوە نیە(٢). ئەم ڕێکخراوە کوردییە دان بـە مافـە نەتەوەییەکانی گەلانی دیکە لە تورکیا ناهێنێ (..)

کوردەکان هیچ ئامانجێکی دیکەیان نیە جگە لەوەی ڕێزلە فەرمانەکانی ڕژێم بگرن تـا ئەو ڕۆژەی کە ئیتر کۆنفرانسی ئاشتی بڕیارێك لە بارەیە مەسەلەکەیانەوە دەدات (..).

**Bulletin Armenien N. 9 juillet 1919 p.8. paris**

## کورتە هەواڵ

دەنگوباس لە دەوروبەری شارەکانی کوردستانەوە گەیشـتۆتە ڕژێمـی تورکیـا: ڕژێمیـان ئاگادار کردۆتەوە کە کوردەکان ئێستا خەریکن خۆیان پڕ چەك دەکـەن و زۆر تونـدو تیژانـە بـە جـۆش کـەوتوون. ئـــەم هەڵســـوکەوتەی کوردەکـــان دەســـەڵاتدارانی تورکـــی خســـتۆتە مەترسیەوە.

**Bulletin Armenien N, 14: 30 Janv 1920 P.8 paris**

## کێشەی نێوان ئەرمەن و کورد

ئەو نامەیەی کە ژەنەراڵ شـەریف پاشـا لـە ڕۆژنامـەی Lematin لـە ڕۆژی ٨ی مارسـدا بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها ئەو وتارەی کـە لـە ڕۆژنامـەی Temps لـە ڕۆژی ١٠ی مـارس دا بڵاوی کردۆتەوە(٣)، هەردووکیان بە سەهووچوونێکی لە لایەن نووسەرەوە تێدایە کـە ئێمـە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین لێرەدا نەشتەر قەڵەمێکیان بکەین.

ژەنـەرال نووسـیویەتی کـە لـە دووای شـەر راوەسـتان لەگـەڵ ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی "وڵاتی کوردان بە تەواوی بۆتـە نیچیریك. هـەم ریكخـەرە سیاسـییە ئەرمـەنییـەکان و هـەم هەندیك لە هیزە هاوپەیمانەکان مرخی خۆیان لیی خۆش کردووە.."

ئەم گازاندەیە هیـچ بنەمایـەکی راسـتی نیـە، ئـەو وەفـدە ئەرمـەنییـەی لـە کۆنفرانسـی ئاشتیدا بە ناوی گەلی ئەرمـەنەوە بەشداری کردبوو. لـە یاداشـتنامـەکەی خۆیـدا داوای هیـچ زەوی و زاریکی ئەوتۆی نەکردبوو کە سەر بە "کوردستان" بیت(٤).

ئەرمـەنییەکان هەرگیز ریگەیان بە خۆیان نەداوە بلیـن "کوردسـتان تـەنیا زاراوەیـەکی جوگرافیی تازە دروست کراوە" بەلکو هەمیشە دانیان بەوەدا ناوە کە نیشمانیکی کورد بـە راستی لە تەنیشت ئەرمینیا بوونی هەیە، ئەو نیشتمانە چەندین سەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی کە وەکو ئیمەی ئەرمەن لە رەگەزی ئارین و ئیمەش هەست دەکەین ئەو نەتەوەیە زیاتر لە ئیمەوە نزیکن وەك لە تورك، بەڵام هیندە هەیە کە بەشیکی ئەو نیشمانەیان -خۆ هەر بە دەسـتی ئەرمـەنییـەکانی چاخـە کۆنـەکانیش ئـاوەدان کراوەتـەوە- ئـەمرۆ بـە زۆری ئیسـلام کراوەو بە کوردی ئـەو نیشـتمانەی کوردەکـان، هـەر لـە سـەردەمی ئیگزەنەفۆنـەوە کـە بـە کورستانو ئەرمینیادا تیپەر ببوو، بە داخەوە نەیتوانیوە پی بە پیی شارسـتانیەت بـروات، هەمیشەش لەسەر داب و نەریتە کیوییە سەرەتاییەکانی خۆی ماوەتـەوە. ئەرمـەنیـەکان، بـە دریژایـی سـەدەی نۆزدەهـەم، چـەندین هـەول و کۆششـیان نوانـدووە بـۆ بڵاوکردنـەوەی خوینـدەواری و رووناکـبیری لـە کوردسـتان دا، هـەولیان داوە کـە هەسـتی نەتەوایـەتیی کوردەکان بە جۆش بهینن و تامی کولتوورو رۆشنبیری لەسەر زمانیان شرینتر بکەن. بـەڵام هەموو ئەو کۆششانەی ئیمە، بە داخەوە، بە فیرۆ چووە، چونکە دام و دەزگای رژیمـی تـورك هەمیشە کۆسپ و تەگەرەی خستۆتە نیوانمان و هەمیشە ویسـتوویەتی کوردەکـان سـەرچیغ ببات و لەناو زەلکاوی کلۆلیی رۆشنبیری و ئـابووریدا بیانهیلیتـەوە، ئەمـەش بـە تایبـەتی

لەژێر فەرمانرەوایەتی سولتان عەبدولحەمید کە چووە ژێر کلیشەی کوردەکانەوەو دژی ئەرمەنییەکان بە گەری خستن (..).

(..) وەفدی ئیمە لە وەلامدانەوەی یانەی نەتەوەیی کوردەکاندا Kurde Club National لەئە ستەمبۆل (٥) رازی بوونی خۆی پیشان داوە بۆ ئیمزاکردنی ریکەوتننامەیەك لەگەڵ شەریف پاشا لە پیناو بە جیگەیاندنی داخوازییە رەواکانی گەلی کورد: بۆ ئەوەی گەلی کورد بتوانیت بە ئازادییەوە لەسەر خاکی نیشتمانەکەی خۆیدا خۆی پیکەوە بنیت. ئەمە شتیکی سەیرە کە شەریف پاشا هاتووە ئەرمەنییەکانی تاوانبار کردووە بەوەی گوایە بوونی گەلی کوردو نیشتمانی کوردیان پیشیل کردووە (..).

(..) ئەگەر ئەنجوومەنی کۆنفرانس بریار بدات، وەك ئەوەی ژەنەراڵ شەریف پاشا بیری لی دەکاتەوە، کە کوردستان دابەش بکریتە سەر دوو زۆن و هەر زۆنیك لەژیر ئینتدابی هیزی هاوپەیمانیکدا بیت، لەو کاتەدا نابێ ئەم کارە بە زیانی ئەرمەنییەکان بکشیتەوە (..).

(..) هاوئایین بوونی کوردو تورکەکان بە هیچ شیوەیەك رەوایی ناداتە ئەوەی کە شەریف پاشا ئۆتۆنۆمی کوردەکان لەژیر سەرپەرشتی تورکیادا بە باشتر بزانێ، چونکە ئاشکرایە جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی لەم بابەتە لە "تەلەیەك" زیاتر هیچی تر نابێ، عەرەبەکان، ئەلمانییەکان، خەباتیان کرد بۆ سەربەخۆیی سیاسیان، واتە بۆ جیابوونەوەی تەواوی خۆیان لە دەست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

مەسەلەی ئایین پەیوەندییەکی یەکجار زۆر کەمی بە سەربەخۆیی نەتەوەیی و ئازادییەوە هەیە. خەباتی گەلی ئەرمەن خەباتیکی ئایینی نیە. بەلکو تاقە ئامانجیکی ئەوەیە کە ئیمەی گەلی ئەرمەن بە سەربەخۆیی نەتەوەیی خۆمان بگەین. لە سۆنگەی هەمان شتدا، دووای ئەوەی پیرۆزباییمان لە سەربەخۆیی گەلی موسلمانەکانی وەکو ئەلبانییەکان و

عەرەبەکان کرد، بە هەمان شیوەو بە دلگەرمیییـــەوە بـە تـەنگ بانگـەوازی کوردەکانیشـەوە چووین بۆ ئەوەی هاوکاریان بکەین ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان وەدەست بینن (..).

ئیمە وا هەست دەکـەین ئـەم دوو وتـارەی شـەریف پاشـا، تـەعبیر لـە بیروبـاوەری ئـەو نیشتمانپەروەرە کوردانە ناکات کە لە ئەستەمبۆل "یانـەی نەتـەوەیی کوردیـان" لـە پینـاو وەدەستهینانی سەربەخۆیی کوردستان دامەزراندووە. هەر لەبەر هەمان هۆش، ئەم نیشتمان پەروەرە کوردانەی "یانەی نەتەوەیی کـورد" ریگایـەکی دابریـان گرتۆتـە بـەر و هـەر تـەنیا ماوەیەکی کەم لەمەوبەر رەفزی ئـەوەیان کردبـۆوە کـە لـە هەلبژاردنـەکانی (ئینتخابـاتی) پەرلەمانی تورکیدا بەشداری بکەن(٦) ئیمـە هیواداریـن گـەلی کـورد لـە ریگـای خـەباتی جیابوونەوەو ئازادیخوانەی خۆیدا هەر جەسوور و بەردەوام بیت.

Bulletin Armenien N, 18- 19- 20, 30 Avril 1920p04 paris

## درکاندنی چەند نهینییەك
## لە لایەن سکرتیری تایبەتییەوە

**لـە رۆژنامـەی ڤەرجینـە لـوور Vertchine Lour ئەرمەنییـەوە وەرگـیردراوە، رۆژی ١٩٢٠/٢/٢٧.**

لە نامەیەکدا کـە لـە رۆژنامـەی Alemderدا بلاوکراوەتـەوە، غـالیب بـەگ، سـکرتیری تایبەتی شەریف پاشا روونی دەکاتەوە کە چـۆن شـەریف پاشـا هاتۆتـە سـەر ئـەوەی بچیـت داخوازیی دامەزراندنی دەولەتیکی کوردی بکـات بـۆ ئـەوەی بـەم داخوازییـە تەگـەرە بخاتـە بـەردەم داخوازییـەکانی ئەرمەنییـەکان، هـەروەها چـۆن بـە مەبەسـتی ئـەوەی کـە هەنجـەتی نەتوانینی خۆبەریوەبردنی کوردەکان پووچەل بکاتەوەو بتوانیّ لـە کۆنفرانسـی ئاشـتیدا لـە هەمـان ئاستی ئەرمەنییەکاندا خۆی بنوینیّ، توانیویەتی قەناعـەت بـە بۆگـۆس پاشـا Bo ghos Pacha بهینیت و ئیمزای ریککەوتننامەیەکی پیبکات.

ئەم کارەی شەریف پاشا، بێگومـان، بـە سـەرکەوتنێکی دیپلۆماسـی لـە قەلـەم دەدرێ (..).

غالیب بەگ، دوای ئەوەی دەڵـێ کـە ئـەم دەسپێشـخەرییە نیشـتمانپەروەرییەی شـەریف پاشا لە بـەردەم کۆنفرانسـی ئاشـتیدا بـە ئاشـکرا روونـی کـردەوە کـە ئـەو زەوی‌و زارانـەی ئەرمەنییەکان داوایان کردبوو، بە هیچ شیوەیەك سەر بە وڵاتی ئەرمەن نین، بەڵکو سەر بـە کوردستانن؟ هەروەها شەریف پاشا چەندین نامەی ناردووە بۆ جەمعیـەتی تـەعالیی کـورد Union Teali Kurd، بۆ سەرەك عەشیرەتە کوردەکان: پێـی راگەیـاندوون کـە ئـەو هـەر لـە ئیستاوە ئامانجە سیاسییەکانی دەرەوەی وڵاتـی کـە پێـی سـپێردرابوون جێبـەجێ کـردوون، ئیدی ئیستاش -بە بیروڕای ئەو- سەرفرازیی گەلی کورد لەوەدایە کە لەگەڵ تورکیا بـبن بـە یـەك. کوردسـتان پێویسـتە ئۆتۆنۆمییـەکی ئیـداری وەدەسـت بـهێنێ، بـەڵام لـە رووی سیاسییەوە هەمیشە سەر بە تورکیا بێت.

غـالیب بـەگ -خـۆی ئـەم نامەیـەی گەیاندۆتـە (جەمعیـەتی تـەعالیی کـورد" لـە ئەستەمبوول، ئیسـتاش چـاوەڕێی وەڵامیـان دەکـات. دەلێـن گوایـە ئەگـەر پێشـنیارەکانی شەریف پاشا پەسەند نەکرین، ئەوا شەریف پاشا ئیستقالە دەدات و چیتر رازی نابێ ببیتـە نوێنەری وەفدی کوردان لە کۆنفرانسی ئاشتیدا لە پاریس.

**Bulletin Armenien**
**30 Mors, 15-30 Avril 1920, p. 4**

## بیروڕای چەند کوردێك

بەڕێز ئەکرەم جەمیل پاشـا Djemil Pachazade Ekrem Beg یـەکێك لـە ئـەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی جەمعیەتی تەعالیی کورد Teali Dlemieti کە یەکێکـە لـە رێکخـراوە کوردییـە هـەرە بـەهێزەکان، ئـەم راگەیاندنـەی خـوارەوەی لـە رۆژی ١٨/٢/١٩٢٠ داوەتـە رۆژنامەی (جاگادامارد- Dihagadamard):

-بەشی هەرە زۆری گەلی کورد، بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە، داخوازیی جیابوونەوەو سەربەخۆیی دەکەن. تورکەکان پەیتا پەیتا چەندین تەلەگرامی ناوخۆییان بۆ ویلایەتە کوردییەکان شاندووە، بەلام ئەم تەلەگرامانە هیچ نرخیکیان بۆ دانەنراوە، چونکە تەلەگرامی درۆزنانەن. ئایا تورکەکانی سەر بە حیزبی میللی Milli رایان نەگەیاندبوو کە ئەرمەنییەکانیش هەر، بی پشت و پەنا لە ولایەتەکانی رۆژهەلاتدا، چوونەتە پال کوردەکانەوە؟!

ئەم جۆرە بانگیشەیە، درۆ و دەلەسەی تورکەکانن، جیهانی دەرەوە باش ئاگاداری ئەو زەبروزەنگە وەحشیگەرانەیەی تورکەکانن کە دەرهەق بە گەلی ئەرمەن و یۆنانی دەینوینن. خۆ کوردیش هەر لەم زەبروزەنگ و چەوسانەوەیە بیبەش نەبووە.

ئیمەش وەکو ئەرمەنییەکان راگویزراوینەتەوە، قەتلوعام کراوین. زیانەکانی ئیمە گەیشتوونەتە سەدان هەزار. بەو زیانانەی لە ماوەی جەنگیشدا لیمان کەوتوون، سەرجەمیان دەگەنە میلیۆنیك. سەبەبکاری ئەم قەسابخانەیەش هەمووی مستەفا کەمالە، سەرۆك بزووتنەوەی ناسیونالیزمی تورك.

تەلعەت پاشاو ئەنوەر پاشا قوریان بۆ ئەرمەنییەکان گرتەوە، بۆ یۆنانی و ئاسورییەکان، جەمال پاشا بۆ عەرەبەکان، مستەفا کەمالیش بۆ ئیمەی کورد.

شەریف پاشا لە سەرەتادا نوینەری "جەمعیەتی تەعالیی کورد" بوو، واتە مەندووبی شەریف پاشا، سەرلەنوێ لە لایەن حیزبی ناسیونالیستی کورد Parti Nationl Kurde کە لەم دواییەدا سازکراوە دووپات کرایەوە. ئیمە دەتوانین بلیین کە پەیامەکەی شەریف پاشا سەدایەکی بەرزی دایەوە و لە کۆنگرەی نەتەوەیی کورداندا، کە پیش دوو مانگ لە شاری ماردیندا سازکرابوو، بە هەلویستیکی جوامیرانە لە قەلەم درا.

کۆنگریسی نەتەوەیی کورد Congres Nationl Kurde ئەو کۆنگرەیەی لە شاری ماردین دا بە تەواوی دەنگ هاورایی خۆیان بۆ شەریف پاشا دەربری و متمانەی خۆیان بە شەریف پاشا دووپات کردەوە.

لیرەدا بۆ ئەوەی بۆتانی بسەلمینم کە ئیمە مافی ئازادی و سەربەخۆیی خۆمان هەیە، پیتانی رادەگەیەنم کە تورك بە هیچ شیوەیەك کوردیان لە خشتە نەبردووە. کوردستان - خۆی، بە خواستی خۆی، خۆی بە تورکیا گرێ داوەتەوە.

کوردەکان سەبارەت بە سوننی بوونیان بە هانای سولتان سەلیمی عوسمانی کەوتن و یارمەتییان دا بۆ ئەوەی سەرکەوتنی بەغدا وەدەست بهینێ. ئیدریسی بەتلیس، یەکیك لە کوردە بە توانا و دەسەلاتدارەکانی ئەو سەردەمە، کاتێ لە بەغدا گەرایەوە، بە سولتان سەلیمی راگەیاند کە کوردەکان دەیانەوێ لەگەل تورکیا ببن بە یەك. ئیدی بەسترانەوەی کوردستان بە تورکیاوە هیچ گیروگرفتیکی نەهاتە سەر رێ.

رۆحی کورد پرە لە رق و کینە دەرهەق بە زەبروزەنگی تورکەکان. ئەم رق و کینەیەش زۆر بە ئاشکرا لە گۆرانییە فۆلکلۆری و نەتەوەییەکانماندا رەنگیان داوەتەوەو نیشانەی جەنگەکانی نیوان تورك و کوردن. ئەم گۆرانییانە گالتە بە ترسنۆکیی تورکەکان دەکەن، ئەوە نیشان دەدەن کە تورك لە راوەرووت و زەبروزەنگ و تالانکردنی مالی خەلك زیاتر حەز لە هیچ شتیکی دیکە ناکەن. گۆرانییە هاوچەرخەکانیشمان، بەدکارییەکانی رژیمی ئەمرۆی تورکیا پیشان دەدەن، دەسەلاتخوازیی والیەکان، دزی و حیزی و پۆخلەواتەکانیان، بە زۆر سەپاندنی باج و سەرانەکانیان..

زمانی تورکی بە قەد زمانی چینی عەنتیکە و سەمەرەیە بۆ خەلکی رەشۆکی کورد، جوتیارە کوردەکان بە هیچ شیوەیەك تورکی نازانن، بە تەنیا کوردی و ناو شارەکان تورکی دەزانن.

* * *

دووای ئـەو دەماقالییانـەی کـە لـە پەرلــەمانی تورکیــدا کــراون، ســیناتۆری کــورد عەبدولقادر ئەفەندی، ئەم راگەیاندنەی خوارەوەی دابووە چەند رۆژنامەنووسیك:

"ئەرمەنییەکان لە کۆنفرانســی ئاشـتیدا داوای هـەر شـەش ویلایەتەکـەی رۆژهـەلاتیان کردبوو. ئیمەی کوردیش بە هەمان شیوە رووما‌ن لە کۆنفرانسی ئاشتی‌نا بۆ ئــەوەی روونـی بکەینـەوە کـە ئیمـەی کوردیـش، لەبـەر ئـەوەی بەشـی زۆری دانیشـتوانی ئــەو ویلایەتانــە پیکدەهینـین، داوا دەکـەین وەفدیکــی تایبــەت بنیردریتــە ئـەو ویلایەتانــە بــۆ ئــەوەی لیکۆلینەوەیەکی سەرجەمگیر لە بارەی ریژەی دانیشتوانی کوردو ئەرمەن سازبدریت.

(بۆگۆس نووبار پاشا) رازی بوو لەسەر ئەوەیی کە ئەو وەفدە بنیردریتە ئەو ویلایەتانە، هەروەها گفتی ئەوەی دا کە چیتر پرۆپاگاندە دژی نەتەوەی‌کورد نەکات".

"لە بارەی شەریف پاشاشەوە، بیگومان ئاشکرایە کە ئەو نوینەری جەمعیەتی تەعالیی کوردانە. ئەم جەمعیەتەش بۆ ئیمە نوینەری هەستی نیشتانیمانە. کەواتە، شەریف پاشـا بـە تەواوەتی مافی ئەوەی هەیە کە لەویّ وەك نوینەری گەلی کورد رەفتار بکات". "ئیمە داوای ئۆتۆنۆمی هەر ئەو پینج ویلایەتەمان کردووە کە لــە رۆژهـەلاتی تورکیـادا کوردیـان تیـدا دەژی. ئیمە خۆمان بە دەرووەست دەزانـین لـە ئاسـت ئـەوەی کـە ولاتەکـەمان بـەرەو پیشـەوە ببـەین و هـەنگاو بـەرەو بەهرەمــەندەکانی نەتەوەکـەمان. بیگومـان تورکـەکانیش دەتوانــن بەشداری لە کاروبارەکانی دەسەلاتداریتی Gouverment بکەن. بەلام ئیمە ئەگەر بیین پشت بە لاوازیی خۆمان ببەستین و خۆمان بدەینە پـال ئەرمەنییــەکان لـە دژی تـورك، ئـەوا ئـەم هەلویستە دەبیتە شیوە خیانەتکاریەکی بیّ ماناو پرووپووچ".

**Bulletin Armenien**
**30 Mors, 15- 30 Avril 1920, p.**

## پەراویزەکانی وەرگیر:

١-بەشیك لەو تۆمار و بڵاوکراوانە، وەکو (تیگەیشتنی راستی ١٩١٨) (پیشکەوتن ١٩٢٠- ١٩٢١).. هتد سەر بە دام و دەزگای ئینگلیزەکان بوونە، واتە دیاردە و رووداوەکانیان لە گۆشەنیگای ئایدیۆلۆژیەت و بە پێی بەرژەوەندی سیاسی خۆیان هەڵسەنگاندووە. بڵاوکراوەو رۆژنامەکانی زمان خالی شۆرشی شیخ مەحموودیش، وەکو (امید استقلال) (بانگی کوردستان)، نەیانتوانیوە لە سنووری سلیمانی بچنە دەرەوەو (کوردستانی دەرەوەی سلیمانی) بخەنە ژیر تیشکی لیکۆڵینەوەی رۆژنامەنووسیانەوە.

٢-Club National Kurde کە وەرگیرانە کوردییەکەی دەقاودەق دەکاتە (یانەی نەتەوەییکورد) لە سالی ١٩١٩-١٩٢٠دا لە ئەستەمبۆل هەبووە. لە کۆتایی ئەم دۆکیوومەنتەدا کەسیکی دیکەش باسی ئەم یانە کوردییەی کردووە، بروانە پەراویزی (١١) کامەیە و ناوەرۆك و ئەندامەکانیان چۆن و کێ بوونە!

٣-رۆژنامەی Temps, Le Matin دوو رۆژنامەی فەرەنسین کە لە سەرەتای سالانی بیستەکاندا بەزمانی فەرەنسی بلاو دەکرانەوە ٠ ژەنەرال شەریف پاشای کورد، بەردەوام لەم دوو رۆژنامەیدا وتاری لە پیناو بەنیودەولەتی کردنی کیشەی کورد هەروەها لە باری مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردو پیویستبوونی سەربەخۆیی کوردستان بڵاوکردۆتەوە.

ئەم وتارە جۆراوجۆرانەی ژەنەرال شەریف پاشا کە بە زمانی فەرەنسی لە بارەی سەربەخۆیی کوردستان لە نیوان سالانی ١٩١٩-١٩٢٥دا لە گۆڤار و رۆژنامە فەرەنسیەکاندا بڵاوکراونەتەوە، بایەخیکی تا بلیی گرنگیان بۆ لیکۆڵینەوە میژوویی‌و سیاسییەکان لە بارەی بزووتنەوەی ناسیونالیستی کوردلە سەرەتای ئەم سەدەیدا هەیە. ئیمە

ئـەم دوو وتـارە نـاوبراوە و چـەند وتـاریکی دیکـەشمان کردوونەتـە کـوردی و لـە داهـاتوودا پێشچاو خوینەرانی دەدەین. شایانی باسـە ئـەم تۆمـارە ئەرمەنییـەی بەردەسـت، رەخنـە لـە بۆچوونە سیاسیەکانی دوو لەم وتارانەی شەریف پاشا دەگرێ.

٤-ئەم پەراویزەی خوارەوە هی سەرچاوەی ئەسلییە ئەرمەنییەکەیە. دەڵێ (هـەموو مـان دەزانین کە سەرۆك وەفدی کوردان، شەریف پاشا هەروەها وەفدی ئەرمەنییەکانیش، پیکـەوە هەر یەکە و یاداشتنامەیەکی خۆیان پیشکەش بە کۆنفرانسی ئاشـتی کردبـوو لـە پـاریس. بلاوبوونەوەی ئەم یاداشتنامەیەی شەریف پاشا هەرایەکی بێ ئەندازەی خستە نـاو رۆژنامـە تورکییەکانەوە. ئەو رۆژنامە تورکییانە شەریف پاشا بە کابرایەکی "هیچ" لە قەڵـەم دەدەن و دەڵین کە ئەو بە هیچ شیوەیەك نوینەری نەتەوەی کورد نیە. هەروەها گوایە شەریف پاشـا ئەو یاداشتنامەیە لەسەر داخوازی ئەرمەنەکان پیشکەش کردووە. بۆ ئەوەی لە هەمان کاتدا ببیتە هاندەرو داخوازییەکانی ئەرمەنییـەکانیش دانیـان پیدابـنریت. رۆژنامـە تورکییـەکان دەڵیـن کـە گوایـە نەتـەوەی کـورد بـە شـیوەیەکی ئۆفیسـیاڵ رایگـەیاندووە کـە ئاگـای لـە ئیمزاکردنی ئەو یاداشتنامەیە نیەو شەریف پاشا تەنیا لە پیناو بەرژەوەندییەکانی خۆی ئەم کارەی کردووە. بـۆ ئـەوەی لـە داهـاتوودا ببیتـە سـەرۆك دەوڵـەتی‌کوردان). بروانـە هـەمان بۆڵتەنی ئەرمەنی ژمارە (٢٠١٩/١٨) لاپەرە (٣) رۆژی ١٩٢٠/٤/٣٠.

٥-لە ژمارە (٢)ی تۆمارەکەدا هیچ شتیك لە بارەی کورد بلاونەکراوەتـەوە. لـە ژمـارە (٣)دا لە لاپەرە (٢)، وتاریك باسی چاوپیکەوتنی کورد و تەتەرەکان دەکات لـە کۆمـاری ئـەرمینیادا، کـە بەسەرپەرشـتی دام و دەزگـای تورکـەکان ئـەنجام دراوە. لـە ژمـارە (٤) و (٥)یشدا شتیکی ئەوتۆ لە بارەی کورد بەدی ناکرێ.

٦-دیاری نەکراوە سـەرۆك و ئەندامـەکانی ئـەم یانەیـە کـێ بوونـە. بیگومـان دەسـتەی نووسەرانی ئەم بۆڵتەنە ئەرمەنییە ویسـتوویانە وا نیشـانی رای گشـتی فەرەنسـی بـدەن کـە گوایە ناکۆکی و ناتەبایی لە نیوان رای گشـتی خـەڵکی کـورد و شـەریف پاشـادا هـەبووە؛

هەروەها گوایە رووناکبیرە کوردەکانی ئەندامەکانی (یانەی نەتەوەیی کورد) دژی بیروباوەڕو هەلویستەکانی شەریف پاشا بوونە لە پاریس.

گەلی کورد لە سالی ١٩١٩دا زیاتر لە سێ کۆمیتەی هەبووە، بە داخەوە لیرەدا پیشان نەدراوە کە باس لە کام کۆمیتەی کوردی دەکات! بەلام لەگەلْ ئەوەش، لەوانەیە ئەم کۆمیتەیە (جەمعیەتی تەعالی) بیت کە سەرۆکەکەی (جەمیل پاشازادەی ئەکرەم بەگ/ Djemil Pachazade Ekrem bey) بووە چونکە بە پیی هەمان سەرچاوە، ژمارە (١٨/١٩/٢٠) ٣٠ مارس-٣٠ئەڤریل ١٩٢٠ لاپەرە (٤).

٧-لیرە بەملاوە لە سێ پەرەگرافی دریژدا رەخنە لە بیروباوەرەکانی شەریف پاشا دەگرێ کە لە رۆژنامەی Le Temos. Matinدا بلاوی کردوونەتەوە لە بارەی مەسەلەی دیاری کردنی سنووری جوگرافی- سیاسی بۆ ئەو دوو دەولەتەی لە داهاتوودا بۆ گەلی ئەرمەن و کورد دروست دەکرێ. دەلێ: هیچ مەلبەندیك لە جیهاندا بە قەد مەلبەندەکانی وان و بەتلیس ئەرمەنی نین".

**سەرچاوەی تیکرای بەشەکانی ئەم دۆکیوومەنتە، ئەمەیە:**

**Bulletin Armenien, N, 1 (Juill, 1919 M 25 (Juillet 1920) paris.**

## شیعریك پیشكەش بە ژەنەرال شەریف پاشا

دووای پیشکەشکردنی یاداشتنامەکەی ژەنەرال شەریف پاشا بە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس لە سالی ۱۹۱۹دا، نووسەرو رووناکبیرانی کورد لە هەر چوار پارچەکەی کوردستانەوە، چاوەریی ئەنجامی ئەم خەباتە بوون و ئەم سیاسەتمەدارە کوردەیان شاباش دەکرد. شاعیری نویخواز، عبدالرحیم رەحمی هەکاری (۱۸۹۰-۱۹۵۸)یەکیك بوولەو شاعیرانە ، کە ئەم شیعرەی خۆی پیشکەش کردووە و لە ژمارە (۲۱)ی گۆڤاری (ژین) لە ئەستەمبول لە ۱۹۱۹دا بلاوکراوەتەوە:

### ژ بۆ شەریف پاشا

دیسا ژ شەجاعەتا تە ئەی خان
دەریەك ڤەبوو ژ بۆ مە کوردان
ئیدی بەسە ئەڤ جەفاو زیللەت
بێ عیلم و فەزل بمنینە میللەت
ئە ڤ ئەسرە بلندییێ دخازت
هەتا ئەو کو ژین چیە، بناست
فەخرێ دکەین ئەم ب تە، تو کوردی
ئەلهەق کو تو میری، هەم تو مەردی
پشتا تەیە جوملە کورد، کورمانج
لەورا کو تە هەق کریە ئارمانج
کورمانج هەڤیقەتا شینانە
لەورا کو دوی ریبیدا فیدانە.

عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری: ژین ژمارە (۲۱) ل (۱۵-۱٦). ئەستەمبۆڵ (۱۹۱۹).



LE CONSTITUTIONNEL

ORGANE DU PARTI RADICAL OTTOMAN

ŞERIF PACHA

رۆژنامەی مەشروتیەت بە زمانی فەرەنسی

## یاداشتنامەیەکی دیکەو کۆششی ژەنەراڵ شەریف پاشا لە پیناو ئۆتۆنۆمیی کوردستان لە سالی ١٩٤٦

Monsieur le Président
de l'Organisation des Nations-Unies,
LONDRES.

Les représentants du peuple kurde en Irak, confiants dans l'esprit de justice qui anime l'O.N.U. soumettent à la noble Assemblée ce qui suit:-

Les droits reconnus et les promesses faite au peuple kurde n'ont pas été respectés. Les autorités irakiennes ont méthodiquement négligé le peuple kurde au triple point de vue culturel, social et économique. Depuis plus de vingt ans, loin de respecter ses droits en tant que peuple autonome vivant dans un pays éthniquement et historiquement kurde, toute l'activité des dites autorités se concentre sur les moyens de le désagréger et l'erabiser.

C'est pourquoi le peuple kurde demande son indépendance [illegible] au sein du Royaume de l'Irak et par conséquence la création d'un gouvernement autonome [illegible] engager le peuple dans la voie du progrès et dont les relations étrangères seraient confiées à un ministère des affaires étrangères en commun avec le gouvernement irakien.

En tous cas le peuple kurde ne peut être lié par un accord qui serait conclu sans son consentement conformément aux principes du Pacte de San-Francisco.

Les représentants du peuple kurde en Irak.

لە ناوەراستی شوباتی ١٩٤٦ ژمارەیەك سیاسەتمەدارو رووناكبیری كوردی ئاوارەی شاری قاهیرە، داخوازینامەیەك بە زمانی فەرەنسی پیشكەش بە ریكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان لە لەندەن دەكەن و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ كوردستانی عیراق دەكەن.

ئیمە توانیمان ئەم بەلگەنامە گرنگە، لەگەل برووسكە عەرەبییەكەی وەزیری دەرەوەی عیراق، لە ئەرشیفخانەی "بەشی لیكۆلینەوە ستراتیژییەكانی رۆژهەلاتی ناوەراست" لە ئامۆژگای بالای "غاسپای" لە پاریس بدۆزینەوەو لیرەدا پیشكەشی بكەین.

دووای پشكنین بۆمان دەركەوت كە ئەم داخوازینامەیە، پاش ئەوەی پیشكەش بە "نەتەوە یەكگرتووەكان" دەكریت؛ دەنگدەداتەوەو ژاوەژاوەیكی زۆر لە ناوەندە سیاسییەكاندا دروست دەكات؛ چەندین رۆژنامە و گۆڤاری میسرو عەرەبیی دیكە و فەرەنسیش لە سەری دەنووسن و لیكی دەدەنەوە، لەوانە:

-رۆژنامەی (النهار) ژمارە (٢٣٠٤) لە رۆژی ١٧/٢/١٩٤٦.

-رۆژنامەی (لۆ ژووغ نووڤۆ)ی فەرەنسی، ژمارە (٧٠-٧١) لە ١١/٣/١٩٤٦ كە لە بەیرووت دەردەچوو.

بە پیی ئەو دوو سەرچاوە عەرەبی و فەرەنسییە، حزبیكی كوردی بە ناوی (رزگاریی كورد) لەو ماوەیەدا لە ئارادا هەبووەو ئەم داخوازینامەیەی پیشكەش بە "نەتەوە یەكگرتوەكان" كردووە. بە پیی لیكۆلینەوەیەكی دیكەش، بە ناونیشانی "الكورد فی الوثائق البریطانیة"، لەندن: ١٩٩١، ل ٢٤٨) نووسراوی ولید حمدی: ژەنەرال شەریف پاشا پیش هەولدانی ئەم كۆمەلە كوردە لە قاهیرە، هەولدانی شەخسی و تایبەتیی داوە بۆ ئەم

